حکومەتا هەرێما کوردستانێ - عیراق

وەزارەتا پەروەردێ

رێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام وچاپەمەنییا

# بابەتێن کۆمەلایەتی

## بۆ پۆلا هەشتێ بنەڕەت

دانان

جوگرافیا

د.سلیمان عبدالله اسماعیل | هاشم یاسین حمد امین
سۆزان مووەفەق عبدالعزیز | حکمت عبدالعزیز حمد

مێژوو

د.قادر محەمەد پشدەری | د.عبدالحکیم ئەحمد مام بەکر
د.مەهدی قادر خضر | میقداد حسێن تەها

هاونیشتمانی بوون

خورشید عزالدین معروف | یوسف ئوسمان حەمەد

پێداچوونا زانستی

پ.د.ئازاد نەقشەبەندی

وەرگێران

لیژنەیەک ژ رێڤەبەریا گشتی یا پەروەردا دهۆکێ ئینا یە سەر زارێ کرمانجییا ژۆری

چاپا شەشێ ٢٧١٥ کوردی ٢٠١٥ زایینی ١٤٣٦ مشەختی

## دەسپێک:

ژ کیشوەرێن ئەردی ئاسیا مەزنترین کیشوەر ژ و رووبەرێ وی نزیکی (٤٤) میلۆن کیلۆ مەترێن دوجار یە ، ئاکنجیێن ڤی کیشوەرێ رێژا ٦٠٪ ژ ئاکنجیێن جیهانێ پێك د ئینن ،ئاسیا ژ باکووری ڤە دگەل زەریا بەستیێ هەڤ سنۆردارە و دەربەندێ پێرنگ و زەریا یا هێمن ژ دککەڤتە رۆژ هەلاتی ، و ژ لایێ باشووری ڤە زەریا یا هندی دگەل هەڤ سنۆر و ل باشوورێ رۆژ ئاڤای ژی هەردو دەریایێن سۆر و ناڤە راست هەنە ، ل رۆژ ئاڤای ژی سنۆرەکێ هەڤبشك د ناڤ هەردو کیشوەرێن ئاسیا و ئەورۆپا دا هەیە کو ژ زنجیرا چیایێن ئۆرال پێکدهێن و کوردستان د کەڤیت ئاڤ ڤی کیشوەری.

## بلندی ونزمیا کیشوەرێ ئاسیا:

مەزنترین کیشوەرێ جیهانی یە ژ بەر هندێ دیاردێن سروشتی یێن زۆر مەزن و حێبەتی تێدا هەنە .

پێکهاتێن لە سەر روویێ ئەردی ل ئاسیا ب ڤی شیوێ خوارێ دهێنە جوین (پۆلین) کرن :-




نەخشێ سرۆشتێ ئاسیا

**أ – دەشت:**

ژ سەرجەمێ گشت یێ ئەردێن ڤی کیشوەری دەشتێن ئاسیا رووبەرەکێ زێدەتر پێك د ئینن ، پشکا زۆرا رۆژ ئاڤای و باکووری رۆژ ئاڤاییێ رۆسیا یا ئاسیا ژ دەشتا پێك دئێت، ژ دەشتێن دیترێن مەزن یێن دی دەشتا هەردو رووبارێن دجلە و فوراتێ د باشۆورێ رۆژ ئاڤاییێ ئاسیا دا ، هەروەسا دەشتا رووباری گەنج د باکوورێ هندێ و دەشتا رووبارێ میکونج د باشووری روژ هەلاتا ئاسیا دا ، دیسان دەشتا رووبارێ یانگستی د چینێ .

## ب – هەرێمێن چیا :

زنجیرا چیایێن ئاسیا مەزنترین دەڤەرێن چیای ل جیهانی پێك د ئینن ، ئەو زنجیرە چیای پێکهاتینە ژ :

١– زنجیرا چیایێ هیمالایا: دکەڤیتە سنۆرێ د ناڤبەرا هند و چینێ (هیند و میانمار) (چین و پاکستان) دا.

٢– زنجیرا کەرە کورم: ژ لایێ گرنگی ڤە زنجیرا دووێ پێکدئینن، ئەڤێ زنجیرێ گۆپیتکا گەلەکا بلندا جیهانێ بخۆ ڤە گرتیە وەکی گۆپیتکا ئەڤرست.

٣– زنجیرا چیایێن (کەنلۆن و تیان شان) ب درێژاها یا ١٦٠٠ کم بۆ ناڤ ئاخا چینێ درێژ دبن .

٤– زنجیرا (هند و کوشە) کو بەرەڤ ناڤەراستا ئەفغانستانێ درێژ دبیت، ئەڤ زنجیرە ب سەمتا رۆژ ئاڤا درێژ دبیت و د باکوورێ ئیرانێ دەرباز دبیت .

٥– زنجیرا چیایێن سولەیمان : ژ گرێ یاپامیر بەرەڤ رۆژ ئاڤایێ پاکستانێ درێژ دبیت و ژ ئاخا پاکستانێ دەردکەڤیت و دناڤ ئاخا ئیرانێ را دەرباز دبیت هەتا د گەهیتە تورکیا.

هەروەسا زنجیرا چیایێن زاگرۆس و تۆرۆس کو دکەڤنە کوردستانێ.

## جـ - بانی :

چەند بانەك د ناڤ زنجیرێن چیایێن ئاسیا دا هەنە و یا ژ هەمیا بلندتر بانیا تبتە ، گەلەك جارا ب سەربانی جیهانێ د هێتە ناڤکرن ، دکەڤیتە د ناڤبەرا چیایێن هیمالایا و کەنلۆنە دا ، رووبەرێ وێ ١,٣ ملیۆن کیلۆمەترێن دوجار یە ، ئەڤ بانیە بلندیا وێ ژ (٤٣٠٠م) پترە ، ل باشوورێ رۆژ ئاڤایاێ ئاسیاژێ بانیێن

ئەنەدۆلێ ل توركیا و بانیا عەرەبی ل ناڤ عەرەبستانا سعودیێ و بانیا ئیرانێ هەنە و بانیا سیبیریا ل باكوورێ رۆسیا هەیە.

**ئێك: سامانێ ئاڤێ:**

**د- رووبارێن كیشوەرێ ئاسیا:**

ژمارەكا مەزن ژ رووبارا، ل كیشوەرێ ئاسیا هەنە كۆ ژ دەڤەرێن بلندێن ڤی كیشوەری دزێن ود سەمتێن جودا جودا درباز دبن و درێژنە سەر وان دەریا و زەریا یێن د كەڤنە دەور و بەرێن ڤی كیشوەری ،و د ڤان چەند خالێن خوارێدا دێ ئاماژێ ب گرنگترین روبارێن ئاسیا دەین:

١- رۆژ هەلاتێ ئاسیا وارگەهێ رووبارێن هەرە درێژێن ئاسیا یە ، وەكی یانگسنی كو درێژا یا وی ٦٣٠٠كم ژ دەڤەرا تبتێ بەرڤ دەریا یا چینا رۆژهەلاتی ڤە دچیت.

٢- رووبارێن سەرەكیێن باشوورێ رۆژ هەلاتیێ ئاسیا دناڤبەرا زنجیرا چیایاندا دچن وەكی رووبارێ میكونگ كۆ ژ تبتێ دەردكەڤیت و درێژتە دەریایا چینێ ل باشووری، هەر وەسا رووبارێن سالوین و ئیراوادی كو د ریژنە دەریایا ئەندامانە ل باشۆوری بۆرما.

٣- ژێدەرێ رووبارێن هەرە سەرەكیێن باشوورێ ئاسیا چیایێن هیمالایا نە ، وەك هەردو رووبارێن گانج و براهما بوترا كو ل نیزیكی كەنداڤێ بەنگالێ دگەهنە ئێك و درێژنە ڤی كەنداڤی.

٤- تنێ رووبارێن سەرەكیێن باشوورێ روژ ئاڤاییێ ئاسیا دیجلە و فوراتن ، هەردو ژ باكوورێ كورستانێ دزێن وب هەر سێ وەلاتێن توركیا و سوریا و عیراقێ را دەرباز دبن و ل باشوورێ عیراقێ دگەهنە ئیك و رووبارێ شەتلعەرەب پێكدئینن.

٥- سێ رووبارێن هەر درێژێن رۆسیا یا ئاسیا کۆ رووبارێن ( ئووب و یانیسای ولینا ) نە درێژنە زەریا بەستیا باکووری.

٦- رووباری ئوردنێ: دکەڤیتە باشووری رۆژ ئاڤایێ ئاسیا ، درێژیتە دەریا یا مری.

## دەریاچە :

ژ بلی دەریاچەیا مری چەند دەریاچەیێن دیترێن گرنگ ل کیشوەرێ ئاسیا هەنە ژ وان :-

١- دەریاچەیە قەزوێن (خەزەر): مەزنترین دەریاچەیا سویرە ل جیهانێ رووبەرێ وێ (٣٩٤) هزار کیلۆ مەترێن دوجاریە ژ بەر هندێ ب دەریا دهێتە ناڤکرن.

٢- دەریاچەیا بەلکاش : ل وەلاتێ کازاخستانێ یە ، ئاڤا وێ یا سویرە.

٣- دەریاچەیا ئارال : ب ناڤێ دەریا یا ئارا لێشی دهێتە نیاسین و ژ لایێ رووبەری ڤە د ناڤ دەریاچەیێن ئاسیا دا ب پلە دووێ دهێت و نزیکی (٦٤) هزار کیلۆمەترێن چوار گۆشەیە.

٤- دەریاچەیا بایکال : رووبەرێ وێ ٥,٣١ هزار کیلۆمترێن چوار گۆشەیە.

## دو: ئاڤ و هەوا :-

ژبەر بەر فرەهیا رووبەرێ ڤی کیشوەری دبینین کۆ هەمی جۆرێن ئاڤ و هەوای تێدا دەردکەڤن ،ژ بەر هندێ کو ئاڤ و هەوا ژ دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی دهێتە گهورین ، لەورادا کیشوەر ژ لایێ ئاڤ و هەوای ڤە دابەش دبیتە سەر چەندین هەرێمێن ئاڤ و هەوای ، ئەو هەرێم ژی ژ ئەڤێن خوارێ پێکهاتینە:-

١- هەرێما ئاڤ و هەوایێ کەمەرێ:- کو بەشێن دوورێن باشوورێ رۆژهەلاتێ ئاسیا ڤەدگریت ب تایبەتی ئەندۆنیسیا،باران لڤێرێ ب درێژاهیا سالێ د بارن و تێکرایا پلا گەرمێ یا سالانە د ناڤبەرا ( ٢٢-٢٥ ) پلا سەدیدایە .

٢- هەرێما ئاڤ وهەوایێ وەرزی:- ئەڤ هەرێمە دەڤەرێن هیندو هیندیا چینێ و فلیپینێ ڤەدگریت ، زڤستانا وێ ناڤنجي یە و ل هەردوو مەهێن کانینا دووێ و شواتێ پلا گەرمێ تێدا نزم دبت و باران ژی کێم د بارن بەلێ وەرزێ هاڤینێ وەرزێ بارانا و گەرمێ یە لەورا بارانەکا زۆر لێ دباریت.

٣- هەرێما ئاڤوهەوایێ مەنشورا سار:- باکوورێ چینێ و تاداویا باکوورێ ژاپونێ و گزیرتێن سەخالین ڤەدگریت و تێکرا پلا گەرمیا زڤستانا وێ ل هندەك جها دگەهیتە ( ١٥ ) پلا سەدی لبن سفرێ گەرمیا هاڤینێ د گەهیتە (٢٠) پلا سەدی.

٤- هەرێما ئاڤۆو هەوایێ چینێ: رۆژ هەلات و باشوورێ چینێ و باشوورێ ژاپوۆێ ژی ڤەدگریت ، هەر وەسا ژ لایێ گەرمێ هەڤشێوەیە لگەل رۆژ ئاڤایێ ئاسیا بەلێ ژ لایێ بارانا ڤە جودا یە ل دەڤەرا ئێکێ باران ب درێژاهیا سالێ د بارن، بەلێ ل دەڤەرا دووێ باران بتنێ ل وەرزێ زڤستانێ دبارن.

٥- هەرێما ئاڤۆو هەوایێ دەریایا ناڤەراست:- رۆژ ئاڤا و باشوورێ رۆژ ئاڤایێ ئاسیا ڤەدگریت ( کوردستان ب گشتی ، تورکیا ، وەلاتێن شامێ ) زڤستانا ڤێ دەڤەرێ یا سار وب بارانە و هاڤینا وێ یا گەرم و بێ بارانە.

٦- هەرێما ئاڤ و هەوایێ بیابانێ : ئەڤە لسەر دو هەرێمان دابەش دبیت :

### أ- هەرێما بیابانا گەرم :

بیابانێن نیمچە گزیرتێن عەرەبی و ئیراق و شام و دولا سندی وبیابانا سار (الثار) ڤە دگریت ، دهاڤینێ دا پلا گەرمێ لڤێرێ زۆریا بلندە.

### ب- هەرێما بیابانێن مام ناوەندی (هین) :

بانیێن تیبت و ئیرانێ و ناڤەراستا ئاسیا ڤە دگریت ، ئەڤ هەرێمە ب وێ چەندێ دهێتە جوداکرن کو . ( جوداهی دناڤبەرا پلا گەرمێ ل زڤستان و هاڤینێ و شەڤ و روژێ یا زۆرە) ۆ باران ژی د سالێ دا ژ ٣٠٠ ملیمەتران کێمتر دباریت.

٧- هەرێما ئاڤ و هەوایێ سار و شهدار:- دەڤەرێن کیشوەرێن ئاسیا ڤەدگریت د مەنگۆلیا و رۆژئاڤایا سیبریا دا .

٨- هەرێما ئاڤ وهەوایێ تەندرا :- بەشێ باکوورێ کیشوەرێ ئاسیا ڤە دگریت،ب وێ چەندێ دهێتە جودا کرن کو زڤستانەکا درێژ و زۆر سارە هەیە، و هاڤینەکا کورت و ئاڤ و هەوایەکێ هین هەیە و ب درێژاهیا زڤستانێ ب بەفرێ هاتیە نخافتین ، ل هاڤینێ ژی بەفرا وێ د بو هژیت و دبیتە ئەگەرا دەرکەفتنا هندەك گژوگیای

### جـ- رووەکێ سروشتی:- ( خورسکی) :

لدویڤ یا بوری کو دەرکەڤت کیشوەرێ ئاسیا چەندین جۆرێن ئاڤ و هەوای هەنە و چەندین دەڤەرێن بلند و نزم یێن جودا جودا ب رووبەرەکێ بەرفرەھ هەنە ، بێ گومان ئەڤە دبیتە ئەگەرا هەبوونا رووەکێ هەمە جۆر دڤی کیشوەریدا.

**د كيشوەرێ ئاسيا دا ئەڤ هەرێمێن رووەكێ سروشتی دهێتە بەرچاڤ :-**

١ – هەرێما دارستانا كەمەری:- دكەڤیتە داويا باشوورێ رۆژ هەلاتا ئاسيايێ ،ب تايبەتی ل ئەندۆنيسيا.

٢ – هەرێما دارستانا وەرزی:-ل نيمچە كيشوەرێ هندی و ماليزيا و هێندا چينێ و باشوورێ چينێ دهێتە بەرچاڤ.

٣ – هەرێما گژوكيايێ تەندرا:- ل بەشێ باكوورێ ڤی كيشوەری دهێتە بەرچاڤ.

٤ – هەرێما دارستانا سنۆبەری ( كاژ ):- ب هەرێما تايگا دهێتە نياسين، دكەڤیتە باشوورێ هەرێما تەندرا.

٥ – هەرێما رووەكێ دەريا ناڤە راست:- ل رۆژ ئاڤا و باشوورێ رۆژ ئاڤا يێ ئاسيا و ل وان جهێن كو خوە دیێن ئاڤو هەوایێ دەریایا ناڤە راستێ دەردكەڤن.

٦ – هەرێما رووەكێ بياباني:- هەرێمەكا هەژارە ژ لايێ رووەكی ڤە ل بيابانێن ئاسيا دەردكەڤيت.

٧ – هەرێما گژو گيايێ ئەستيپس ( كورت ) :- دكەڤیتە رۆژئاڤايێ سيبيرياو ناڤە راستا مەنشۆريا .

٨ – هەرێما دارستانێن تێكەل:- دكەڤیتە باكوور و رۆژ هەلاتێ چينێ و پشكەك ژ مەنشۆريا و ناڤە راستا ژاپۆنێ .

**٣- ئاكنجيێن ئاسيا:-**

رێژەكا زۆر ژ ئاكنجيێن ئاسيا ل سەر رووبەرەكێ بچووك ژ ڤی كيشوەری كۆمبووينە، ب تايبەتی د باشوورێ رۆژ هەلاتێ ئاسيا دا ، بەلێ رێژەكا كێم ژ ئاكنجيان ل باكوور و ناڤەراست و باشوورێ رۆژ ئاڤايێ ئاسيا دژين ، ئانكو

چریا ئاكنجیان ژ جهه‌كی بۆ جهه‌كێ دی ژ هه‌ڤ جودایه ،چریا ژ هه‌میا پتر دكه‌ڤیته رۆژ هه‌لاتی و باشووریێ رۆژ هه‌لاتی و پشكه‌كا زۆر ژ باشووریێ ئاسیا ، ئه‌ڤ چریا د وان ده‌ڤه‌راندا دگه‌هیته (٥٨٠ ) كه‌سان د هه‌ر كیلۆ مه‌تره‌كا چار گۆشه دا ، د ده‌مه‌كیدا چریا ئاكنجییێن ئاسیا بره‌نگه‌كێ گشتی ( ٨٤ ) كه‌سه د هه‌ر كیلۆ مه‌تره‌كا چار گۆشه دا.




## أ- زمان و گه‌لێن ئاسیا :-

ژ لایێ نفشـــی ڤه ئاكنجیێن ئاسیا لدویڤ زانستێ ئه‌ثنوگرافیا دابه‌ش دبنه لسه‌ر دو نفشێن سه‌ره‌كی:-

١- **نفشێ ئاسیایی:-** نفشێ زه‌ر ل رۆژ هه‌لات و باشووریێ رۆژ هه‌لاتایێ ئاسیا ئاكنجیبووینه . نموونه وه‌كی نفشێ چینیا و ژابۆنیا.

---

ئه‌ثنوگرافیا:- ئه‌و زانسته یێ ڤه‌كۆلینێ لسه‌ر نفشی و رڤشتێ ئاكنجیان دكه‌ت.

٢- نفشێ قەفقازی:- ل باشوورێ رۆژئاڤا و ناڤە راست و رۆسیا دا . هەر ئێك ژڤان ژی دابەش دبنە سەر چەند بەشێن دیترێن لاوەكی و نەتەوا كورد ئێكە ژ وان نفشان.

### ب- دابەشبوونا جوگرافی یا ئاكنجییان :-

ل سالا (٢٠٠٠) ێ ژمارا ئاكنجیێن ئاسیا ب ٣،٧٣ ملیار كەسان هاتیە خەملاندن ، رێژا ٤٠٪ ژ ڤێ هژمارێ د رۆژ هەلاتا ئاسیا دا نە. هەر وەسا ٤٠٪ یێن دیژی ل باشوور و ناڤەراستا ئاسیا د ژین ، رێژا ١٥٪ ژڤان ئاكنجیان د رۆژ هەلاتێ ئاسیا دا خو جه بووینە و رێژا ٥٪ ژ ئاكنجیان ل رۆژ ئاڤا ئاسیا و جهێن دیتر دژین.

هەردوو ولاتێن چین و هندستان ژمارا ئاكنجیێن وان ٢،٣ ملیار كەسن ئانكو سێكا ژمارا ئاكنجیێن جیهانێ نێزیكی ٦٢٪ ئاكنجیێن كیشوەرێ ئاسیا پێكدئینین ب گشتیچریا ئاكنجیان د ئاسیا دا دگەهیتە ٨٤ كەسان دهەر كیلۆ مەترەكا چار گۆشە دا. ئەڤ هەژمارە ژی بلندترە ژ هەمی كیشوەرێن دی.

### ٤- ئابوورێ ئاسیا :-

زۆر ژ ولاتێن ئاسیا ژ لایێ ئابووری ڤە د پاشكەفتینە ، پرانیا ئاكنجیێن ئاسیا د بیاڤێ چاندنێدا كار دكەن، چاندنی ژ ب گشتی دهێتە نیاسین كو بەرهەمێ وێ یێ كێمە ،خەلكەكێ كێم د بیاڤێ پیشەسازییێدا كار دكەن ، پتر ژ كەرتێ خزمەتگوزارییێ دا چالاكڤانن وەكی فرۆشیارێن گەرۆك و خودانێن كارێن دەستی. ب شێوەكێ گشتی بیاڤێن ئابووری ژ ئەڤێن خوارێ پێكدهێن:

### چاندن ل ئاسیا:-

کێمتر ژ سێکا ئەردێ کیشوەرێ ئاسیا بۆ چاندنێ بکاردهێت، بکارئینانا کەرەستێن سادە و دەسپێکی و بکارئینانا گیانەوەران بۆ کێلانا ئەردی تشتەکێ زۆر بەر بلا ڤە ، ژ بەرهەمێن چاندنێ یێن گرنگ ل ئاسیا بەرهەمێ برنجی یە ، برنج د بار و دۆخەکێ شهدار دا گەشێ دکەت ، لەورا ل ولاتێن رۆژ هەلاتێ و باشوورێ رۆژ هەلاتێ و باشوورێ ئاسیا دهێتە چاندن. ئەڤ بەرهەمە ل ڤان ولاتان سالێ دوجارا دهێتە چاندن . هەژی گۆتنێ یە کو دەرامەتێ ئەردی ژ ڤی بەرهەمی ل هەمی ولاتان وەك ئێك نینە ، درامەتێ ئەردی ل هندێ بتنێ دگەهیتە نیڤا درامەتێ ژاپۆنێ . ولاتێن ئاسیا نێزیکی رێژا ٩٠٪ برنجێ جیهانێ بەرهەم دئینن. بتنێ چین و هند نێزیکێ ریژا ٦٠٪ ژ سەرجەمێ گشتییێ برنجێ جیهانێ بەرهەم دئینن.

دگەل برنجی ل ئاسیا گەنم و جەهـ ژی رووبەرەکێ بەرفرەهـ ژ زەڤێن چاندنێ ڤەدگریت، هەروەسا ئاژەل ژی دهێتە خودانکرن ب مەرەما بدە ستڤە ئینانا شیر و گۆشت و هریێ ب تایبەتی ل ولاتێن پێشکەفتی وەکی ژاپۆنێ و کوریا باشۆر و چینێ.

### پیشەسازی:-

پیشەسازی نهۆ ل ئاسیا پێشکەفتنەکا بلەز بخو ڤە دبینیت. ل پێشیا ولاتێن پیشەسازی ل ئاسیا ولاتێ ژاپۆنێ یە کو پیشەسازیەکا هەمە جۆر و زۆرا پیشکەفتی تێدا هەیە ، و ل رێزا ولاتێن هەرە پێشکەفتیێن ئەلکترۆنیاتا و ترۆمبێلا و وزێ و کەرتێ بیناسازیێ ناڤدارە . پیشەسازی ل ژاپۆنێ نیزیکی چارێکەکا هێزا کارێ

ل سالێن شێستا گەلەك ژ ولاتێن ئاسیا چوونە ریزا ولاتێن پیشەسازی وەکی سەنگافۆرە و کوریا باشوور و ئەندۆنیوسیا و مالیزیا و هۆنگ کۆنگ و تایلاندە.

پرانیا بەرهەمێ ڤان ولاتان ژ جل و بەرگ و پێلاڤ و تەلەفزیۆن و ئامیرێن ڤیدیۆیێ پێکدهێت.

# جوگرافیا سرۆشتی یا ئەورۆپا

## جهێ جوگرافی و رووبەر:-

کیشوەرێ ئەورۆپا دکەڤیتە دناڤبەرا بازنا پانا ٣٦ – ٧١ پلە باکورر و هێلا درێژ ١٠پلە رۆژ ئاڤا –٦٧ پلە رۆژ هەلات ، ئەورۆپا پشتی کیشوەرێ ئوستڕالیا بچووکترین کیشوەرێ جیهانێ یە و دکەڤیتە کەرتێ باکورر ژ گۆیا ئەردی رووبەرێ وێ ٣,١٠ مەلیۆن کیلۆمەترێن چار گوشە یە و ٧٪ رووبەرێ هشکاتیا گویا ئەردی پێکدئینیت.

نەخشێ ئەورۆپا یێ سروشتی

ل سەر نەخشێ ڤی کیشوەری وەك نیمچە گزیرتەکا مەزنە و ژ کیشوەرێ ئاسیا درێژ بوویە بەرەڤ رۆژ ئاڤای. کیشوەری ئەورۆپا ژ باکووری ڤە زەریایا بەستی یا باکوورو ل رۆژ ئاڤایڤە زەریایا ئەتلەسی و ژ باشووری ڤە دەریایا ناڤە راست و دەریا یا رەش سنورێ ئـاڤـا ڤی کیشوەری پێکدئینن، ل رۆژهەلاتی ب

هشكاتییْ ب كیشوەری ئاسیا ڤه گریْدایه بتنیْ زنجیرا چیایەكیْ نزم كو پیكهاتیه ژ زنجیرا چیای ئورال ژیْكڤه دكەت.

**پیْكهاتیْن سەر روویێ ئەردی ( بلندی ونزمی ):**

ئەورۆپا ژ كومەكا زنجیرا چیایان و چەند دەشت و بانیەكان پیْك دهیْت . دشیاندا هەیه بڤی شیْویْ خاریْ ریْز بكەین :

**١- بلنداهییْن باكووری رۆژ ئاڤای:** ئەڤەژی بلنداهیێن نیمچه گزیرتا سكەندەناڤیا ( سویْد ونەرویج ) باكووریْ رۆژ ئاڤاییْ بریتانیا و باكووریْ رۆژ هەلاتیْ ئیْلەندا و بەشیْ باكوور و رۆژ ئاڤاییْ فەرەنسا ڤه د كریت بلنداهییْن سكەندەناڤیا ژ لاییْ جیۆلۆجیڤه پیْكهاتەكیْ كەڤن هەیه و تووشی بەر رامالینەكا مەزنا بەستییْ بوویه ، ژ بەر ڤیْ چەندیْ ئەڤیْ دەڤەریْ كەلەگ دەریاچه تیْدا هەنه كو ئەو ژی ژبەر بەستییْ دروست بووینه.

**٢- دەشتیْن ناڤەراست و كناریْن دەریا :** دەشتیْن كناریْن دەریا وەك كەمەرەكیْ لگەل كناریْن دەریایان دریْژ بوویه كو ئەڤه ژی كناریْن زەریاییْ ئەتلەسی و دەریایا پالتیك ڤەدگریت . دەشتیْن ناڤەراست ژی كو دەشتەكا رووی راسته .یا ژ هەمیا مەزنتر ئەو دەشته یا ژ باشووریْ فەرەنسا دەسپیْدكەت بەرەڤ باكوور و رۆژ هەلات و ب ئەلمانیا و پۆلەندا و ئوكرانیا دەرباز دبیت هەتا دگەهته زنجیرا چیاییْن ئۆرال ل رۆسیا . ئەڤ دەشته پانیەكا مەزن و بەرفرهه ژ ئەورۆپا ڤه دكریت و ب دەشتا مەزنا ئەورۆپا بەر نیاسه.

**٣- بانی:** پترپا بانیێن ئەورۆپا دکەڤنە باشووریێ دەشتا مەزنا ئەورۆپا کو یا ژ هەمیا ناڤدارتر بانیا (مێزیتا) یە ل ناڤەراستا ئسپانیا و بانیا فەرەنسا یا ناڤەراست ل فەرەنسا.

**٤- بلنداهیێن ئەلپ:** کو ژ ئەڤێن خاریێ پکهاتینە:

ئەڤژی چەند زنجیرە چیایێن هەڤتەریبن بلندن . گۆپیتکا مۆن بلان بلندترین گۆپیتکە ل ئەورۆپا کو بلنداهیا وێ ٤٨٠٧ مەترە ل سەر ئاستێ روویێ دەریایێ. ل فەرەنسا دەسپێدکەت بۆ باکووریێ ئیتالیا ،و ئەمسا ژ لایێ جولوجیڤە پیکهاتیێ وێ یێ نۆویە.

## ئاڤ و هەوا :

ئاڤ و هەوایێ کیشوەرێ ئەورۆپا ب گشتیێ هین و بارانییە ، هەر چار وەرزێن سالێ ب روونی تێدا دەردکەڤن. ئەڤەژی ڤەدگەریتە ڤە بۆ جهێ جوگرافیێ ئەورۆپا و وان دەریا و زەریا یێن ل دەام روبەرێن دێ هەین. ئەورۆپا هەرێمێن ئاڤ و هەواین جۆرا و جۆر هەنە . دشیاندا هەیەب ڤی جۆری خاریێ دابەش بکەین.

١– هەرێما ئاڤ و هەوایێ تەندرا ( باکووری ئەورۆپا ).

٢– هەرێما ئاڤ و هەوایێ رۆژ ئاڤایاێ ئەورۆپا.

٣– هەرێما ئاڤ و هەوایێ ناڤەراستا ئەورۆپا.

٤– هەرێما ئاڤ و هەوایێ رۆژ هەلاتا ئەورۆپا.

٥– هەرێما ئاڤ و هەوایێ دەریایا ناڤەراست.

## سامانێ ئاڤێ:

ئەورۆپا کیشوەرەکێ دەولەمەندە ب سامانێ ئاڤێ و خودان تۆرەکا بەرفرەها رووبارانە. رووبارێن ئەورۆپا ب شێوەکێ سەرەکی بۆ ڤەگۆهاستنێ و دروستکرنا هێزا کارەبێ بکاردئێن گرنگترین رووبارێن ئەورۆپا پێکهاتینە ژ :

١- رووبارێ ڤۆلگا: درێژترین رووبارێ کیشوەرێ ئەورۆپایە و د رێژیتە دەریایا قەزوین.

٢- رووبارێ دانۆب: ژ رۆژئاڤا بەرف رۆژهەلاتی دچیت و د رێژیتە دەریا یا رەش.

٣- رووبارێ راین: بەرەڤ باکووری دچیت و د رێژیتە دەریا باکوور و ب ئاوایەکێ بەرفرەھ بۆ ڤەگۆهاستنێ دهێتە بکارئینان.

٤- رووبارێ دنیبەر: ژ باکووری بەرەڤ باشووری دچیت و د رێژیتە دەریایا رەش.

ژ بلی رووباران ، کیشوەرێ ئەورۆپا خودان ژمارەکا زورە ژ دەریاچە (البحيرات) ب ناڤ و دەنگترین دەریایێن و روسیا یا ئەوروپی ب درێژاهیا ( ٤٥٠ ) میل ( ٧٧٠کم ) دکەڤیتە سەر دەریاچەیا قەزوین هندەك جاران ژ بەر مەزنیا ڤێ دەریاچەیێ ب دەریا قەزوین دهێتە ناڤکرن کو مەزنترین دەریاچەیا (سویرە ) د جیهانێ دا. ناڤدارترین دەریاچەیێن ئەورۆپا پێکهاتینە ژ هەردو دەریاچەیێن ( لادوژکو و ئونژکو) کو دکەڤنەباکوورێ رۆژ ئاڤایێ روسیا و دەریاچەیا ( جنێڤ ) ل سویسرا و ( بەلاتون ) ل هەنگاریا.

## رووەکێ سرۆشتی ( خورستی ):

دشیاندا هەیە رووەکێ خورستی هەمەجۆرێ کیشوەرێ ئەوروپا و جۆرێن وی و دابەشبوونا جوگرافی د ئەڤێن خارێدا بهێتە کورتکرن:

١- **هەرێما تەندرا:** ئەڤ هەرێمە دکەڤیتە بەشێ باکوورێ ئەوروپا ، رووەکێ ڤێ هەرێمێ ژبەر درێژیا وەرزێ زڤستانێ و سەرما دەڤەرێ ، بتنێ د ناڤەراستا وەرزێ هاڤینێدا گیایێ کورت و کەڤز لێ شین دبیت.

٢- **هەرێما دارستانا کاژێن( سنۆبەر) (تایگا):** ئەڤ هەرێمە دکەڤیتە باشوورێ هەرێما رووەکێ تەندرا و ب داروبارێن کاژان هاتینە نخافتن، باران بارینا وێ ژ هەرێما تەندرا پترە، هندەك گیانەوەرێن کویڤی وەکی هرچ ، گورگ ، رووی‌ڤی و خەزال ل ڤێ هەرێمێ دژین.

٣- **هەرێما دارستانێن تێکەل:** ئەڤ هەرێمە دەڤەرەکا بەرفرەھ ژ ئەوروپا ڤەدگریت ، ژ گزیرتێن بەریتانیا ژ رۆژ ئاڤای و درێژ دبیت هەتا چیایێن ئۆرال ل رۆژهەلاتی، ژ باکووری ڤە باشوورێ هەرێما دارستانێ کاژان دەسپێدکەت هەتا ناڤەراستا ئەورۆپا و باکوورێ رۆژئاڤایێ ئیسپانیا . دڤێ هەرێمێدا دارستانێن کاژان کێم دبن و دارێن بەلگ پان دسپێدکەن. پرانیا دارێن ڤێ هەرێمێ ژ بەر پیشەسازی و کانزا کاریێ هاتینە برین یان ئەردێ وێ بۆ چاندنێ هاتیە بکارئینان.

٤- **هەرێما رووەکێن دەریا یا ناڤەراست:** ئەڤ هەرێما رووەکی د وان ولاتاندا هەیە یێن دکەڤنە سەر دەریایا ناڤەراست ، رووەکێ ڤێ هەرێمێ ژ ئەگەرێ ئاڤ و هەوایێ دەریایا ناڤەراست کو کێم بارانە و پلا گەرمایێ یابلندە ،دارێن وێ

بەرگریا هشکاتییێ و گەرما هاڤینێ دکەن وەکی دارێن زەیتۆن و تەپەدۆر (فلین) وگویز. ل ڤێ هەرێمێ ژی وەکی هەرێما بەرێ ژ بەر زۆریا پیشەسازی وچاندنێ و برینا داران ، پشکەکا زۆر رووەکێن خورستی ژ ناڤ چوون.

**٥- هەرێما گژوگیا ( ستێپس ) :** ئەڤ هەرێمە ژ باشوورێ کەمەرا دارستانا رۆسیا دەسپێدکەت هەتا گۆلا خارێ یا رووبارێ دانوب . ئەڤ هەرێمە ب گژوگیایێ کورت هاتیە نخافتن و د بێژنێ ( ستێپس ).

## جوگرافیا مرۆڤی ل ئەورۆپا

ئاكنجیێن ئەورۆپا ل سالا ٢٠٠٤ ێ نزیكی ٧٣٥ میلۆن كەسان بوون .ب ڤێ چەندێ چریا ئاكنجیان دگەهینە نزیك ( ٧١ ) كەسان د كیلۆ مەترەكا چار گۆشەدا.




## نفشێن سەرەكیین ئەورۆپا :

ئاكنجیێن كیشوەرێ ئەورۆپا بۆ چەندین نفشێن سەرەكی دابەش دبن ، بەلێ ب گشتی پرنیا ڤی كیشوەری سەر ب نفشێ قەفقازینە.

نفشێن ئەورۆپا لسەر چەندین جۆرێن نەوەكهەڤ هاتینە دابەشكرن ، بەلێ ژ هەمیان گرنگتر ئەڤێن خارێنە:

١- نفشێ ( نۆردیک ): ئەڤ نفشە ئاکنجییێن باکوورو باکوورێ رۆژئاڤاییێ ڤی کیشوەری ڤەدگریت. پرچ زەر و چاڤ شینن ، بلندن و سەرێ وان یێ درێژە.

٢- نفشێ ئاڵپی : ئەڤ نفشە ئاکنجییێن دەڤەرا ( ئالپ ) ن و بەشەکێ ناڤەراست و رۆژهەلاتێ ئەورۆپا ڤەدگریت. پرچا وان یا رەشە سەر ب قەهوایی ڤە. بەژن کورتن و سەرێ وان یێ پانە.

٣- نفشێ دەریایا ناڤەراست: ئەڤ نفشە ئاکنجییێن وان وەلاتا ڤەدگریتیێن دکەڤنە سەر دەریایا ناڤەراست.

## وەرارا ئاکنجیان ل ئەورۆپا :

تێکراییێ رێژا وەرارا ئاکنجیان دڤی کیشوەریدا بەردەوام د کێم بوونێدایە

## ئەگەرێن کێم وەرار بوونا ئاکنجیان ل ئەورۆپا:

ل ئەورۆپا کومەکا ئەگەرا هەنە کو بوینە ئەگەرێ کێمبونا وەرارا ئاکنجیا،دشیاندا هەیە د ئەڤێن خارێدا کورت بکەین.

١- ل ئەورۆپا پشتی سالاێن ١٩٦٠ بکارئینا رێبێن رێکخستنا ژ دایك بوونێ ب شێوەکێ بەرفرە بەلاڤبوو ، ئەڤەژی ژ پێخەمەت دروستکرن و رێکخستنا خێزانێ بۆ کو کێم زارۆك هەبن .

٢- ژن ل جڤاکێن ئەورۆپا ب ژمارەکا زۆر کەفتنە کارکرنێ ژ دەرڤەی مالێ و ب ڤێ چەندێ دوویر کەفتن ژ ناڤ مالێ و خودان کرنا زارۆیان یان ژیانا خۆ بێ زارۆ برێڤە د برەن و خێزانا دروست نرا کرەن.

٣- ل پرانیا ولاتان قەبارێ خیزانێ زیدەتر بەرەف بچووك بوونێ ڤە دچیت ؟، کاودانێن ژیارنێ دڤان وەلاتاندا وەسا د خوازن کو خێزان یا بچووك بیت.

## جوگرافیا ئابووری ل ئەوروپا

کیشوەرێ ئەوروپا چالاکیێن ئابووری یێن جۆرا جۆر هەنە . دڤێردا ب کورتی دێ باسێ هندەك چالاکیێن ئابووری کەین.

### چالاکیێن چاندنێ:

چاندن ئێکە ژ چالاکیێن ئابووریێن ئەوروپا ، کیشوەرێ ئەوروپا ژ لایێ ئاڤ و هەوایڤە ب تایبەتی گەرما و باران بارینێ ڤە بگشتی ب کیشوەرەکێ گونجای دهێتە هژمارتن بۆ چاندنێ ، ژ بلی ل هندەك جهێن کیشوەری نەبیت کو ئاڤ و هەوا زۆر یێ سارە،وەکی دەڤەرێن نزیکی جەمسەرێ باکوور یان ئەو دەڤەرێن چیایی یێن ئاسێ پرانیا ئەردێ کیشوەرێ ئەوروپا باران ل دیڤ پێدڤیا چاندنێ دباریت ، هەرچەندە دەڤەرێن دەریایا ناڤەراست ژی وەکو پێدڤی باران هەیە و ل وان جهێن باران کێم لێ دباریت ژی سیستەمێ ئاڤدانێ لێ د هێتە بکارئینان ئەوروپا هەردەم ب هندێ یا بەرنیاسە کو ژ لایێ سیستەمێ بەرهەم ئینانا چاندنێ ڤە هەمە جۆر بوویە ، تەکنیکا چاندنێ دڤی کیشوەریدا بەردەوام د گهورینێدا بوویە . گرنگترین بەرهەمێن چاندنێ یێن ڤی کیشوەری پێکهاتینە ژ دەخل دانی ( گەنم ،جەهـ ، گەنمۆك ) ،پتات ، دارێن فێقی (سێڤ ، تری ،پرتەقال ) زەیتون ، ئەڤە ژ بلی خودانکرنا تەرش و کەوالی.

### چالاکیێن پیشەسازی و کانزاکاری:

بەرهەم ئینانا کەرتێ پیشەسازی و کانزاکاری ل ئەوروپا دەهـ جارا ژ کەرتێ چاندنێ پترە ، ئەوروپا د بەرهەم ئینانا پیشەسازیێدا ل پێشیا کیشوەرێن جیهانێ یە ، پشکەکا زۆرا پیشەسازیێن گرنگ وەکو

پیشەسازیا ترومبێلا و فرۆکا ، شەمەندەفرا ، پاپورا و ئامیرێن رستن و چنینێ و ماکینێن هەمە جۆر دڤی کیشوەری دا کۆمبووینە.

پیشەسازیێ ل ئەوروپا دگەل شورشا پیشەسازی کو ل دەسپێکا چەرخێ هەژدێ ل بریتانیا سەرهلدایە دەسپێکریە و پشتی هنگێ گەلەك بلەز ل ولاتێن دی یێن ئەوروپا یا رۆژ ئاڤا بەلاڤبوویە ، ب تایبەتی ل وان جهێن کو ژمارەکا زۆرا کانێن رەژیێ لێ هەبووین.

کاکلا پیشەسازیا ئەوروپا کو وەلاتێن بەریتانیا ، ئەلمانیا ، بەلجیکا ، هولەندا و فەرنسا بخۆڤە دگریت هەتا ئەڤرۆ ژی پیشەسازیێن وان ل وان دەڤەرا کومبوویە ئەوێن کانێن رەژیێ ب ردادەکێ زۆر لێ بەلاڤ بووینە، ل دەردۆرێن ڤێ کاکلێ وەلاتێن دی یێن پیشەسازی هەنە وەکو باشوور و ناڤەراستا سوید، سویسرا ، باکوورێ ئیتالیا، دڤەرا بەرشلۆنە ئیسپانیا، بەلێ ل دەڤەرێن باشوورێ ئیتالیا ، باشوورێ نیمچە گزیرتا ئیبریا و ئیرلەندا و ایسلەندا و یۆنان ، ئەڤ وەلاتە کێمتر پیشەسازینە، پشتی شەرێ جیهانیێ دوێ ل ئەوروپا پشت بەستن ب کانێن رەژیێ بو پیشەسازێ کێمتر لێهات، ئە ڤەژی ژبەر ئینانا نەفتێ ژ دەرڤەی ولاتی ب تایبەتی ژ وەلاتێن عەرەبی و بکارئینا وێ ل شوونا رەژیێ د بیاڤێ پیشەسازێدا.

## جهێ جوگرافیێ کیشوەرێ ئەفریقیا

کیشوەرێ ئەفریقیا ژ کیشوەرێ ئاسیا بچووکترە، رووبەرێ وی ژ ٣٠ ملیون کم٢ پترە . و ٢٣٪ رووبەرێ هشکاتیا گۆیا ئەردی پێك دئینیت. دەریا سۆر و نۆکەندێ سوێس و کەنداڤێ عەدەن ژ کیشوەرێ ئاسیا جودا دکەت و دەریایا ناڤەراست ژ ئەورۆپا جودا دکەت ، و زەریایا ئەتلەسی کو دکەڤیتە رۆژ ئاڤا ڤی کیشوەری ژ کیشوەرێ ئەمریکا جودا دکەت.

ئەڤ کیشوەرە دکەڤیتە د ناڤبەرا بازنا پانی ٣٧° باکووری ٣٥° باشووری و هێلا یەکسان ل ناڤەراستا ڤی کیشوەریدا د ەرباز دبیتو دکەتە دو بەشێن هەتا رادەکی یەکسان.

### بلندی و نزمیا ڤی کیشوەری:

شێوێن سەرەکێن روویێ ئەردێ کیشوەرێ ئەفریقیا پێکدهێت ژ :

١- بانی: شێوێ سەرەکیێ رویێ ئەردێ ڤی کیشوەریە کو پرانیا کیشوەرێ ئەفریقیا پێك دئینیت . و ژ بیابانا مەزنا ئەفریقیا ل باکوور دەست پێ د کەت هەتا هەرێما کاپ ل باشووری بلندیا ڤی بانیێ د ناڤبەرا ( ٥٠٠- ٢١٠٠ م ) دایە کو دبیتە سێ بەش:

أ- بانیێن باکوور ( بیابانا مەزنا ئەفریقیا ) ژ دەریایا سۆر کو دەست پێ دکەت هەتا زەریایا ئەتلەسی درێژ دبیت.

ب- بانیێن رۆژ هەلات ( بانیا حەبەشە یان ئەسیوبیا ) بلندترین بانیا ڤی کیشوەریە کو تیکرایا بلنداهیا وێ (٢١٠٠م) ژ ئاستێ روویێ دەریایێ.

جـ- بانیا باشوور ( بانیا فیلدا) ئەڤ بانیە پێکهاتیە ژ بلنداهیاێن فیلدای ل سەری و بیابانا کەلهاری.

٢- **چیا :** چیایێن کیشوەرێ ئەفریقیا دابەش دبن سەر سێ جۆران:-
ب پشت بەستن ب وان هۆکارێن کو چیایێن ئەفریقیا دروست کرین ئەڤ بەشێن خارێ بخۆڤە دگرن.




نەخشێ سروشتێ ئەفریقیا

**أ- چیایێن چەمیای (التوائی):**

چیایێن ( ئەتلەس و دراکینز بیرگ) ب خۆڤە دگریت.
زنجیرا چیایێ ئەتلەسی دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ ئەفریقیا بلندترین گوپیتکا وی ٤١٦٥م یا بلندە لسەر ئاستێ رویێ دەریارێ .
بەلێ چیایێ دراکینز بیرگ دکەڤیتە باشوورێ رۆژ هەلاتێ کیشوەری و بلندترین گوپیێکا وی ٣٤٨٢م لسەر ئاستێ روویێ دەریایێ.

### ب – چیایێن شکەستی:

ل دەوروبەرێ دەڤەرا نهالا شکەستی یا ئەفریقیا ئەڤ چیایە دیار دبن ، ئەڤ نهاڵە درێژ دبن ل گەل کنارێن رۆژ هەلاتا کیشوەری وەکی زنجیرا چیایێن رەخێن دەریایا سۆر . ئەڤ چیایە برەخێن تیژ دکەڤیتە هنداڤ دەڤەرێن دەوروبەر .

### جـ - چیایێن گڕکانی:

دکەڤنە رۆژ هەلاتا کێشوەری کو ژ ئەنجامێ خرڤەبوونا ( لەهیاگڕکانی) چیایێن گڕکانی دروست بووینە وەکی چیایێ کلمنجارو کو بلندترین گۆپیتکا وی ( ٥٨٩٥م) لسەر ئاستێ ڕوویێ دەریایێ بلندە ، هەروەسا چیایێ کینی( ٥٩١٤م) و چیایێ فیرونکا (٤٥٦٥م).

## ئاڤ و هەوا:

کیشوەرێ ئەفریقیا ب وی رووبەرێ مەزنێ هەیی ڤە ژ لایێ ئاڤ وهەوای ڤە دابەش دبیتە سەر چەند هەرێمێن جودا کوپێکدهێن ژ:

### ١-هەرێما کەمەری:

دکەڤیتە دەورویشتێن هێلا یەکسان کو تیرۆژکا رۆژێ ب درێژاهیا سالێ ستوونیە ئو درێژیا شەڤ و رۆژا یەکسانە، و تێکرایێ سالانە یێ پلا گەرمیا دەڤەرێ ٢٧° سەدیە و باران هەردەم ل ولاتێ کونغۆ و گابۆن و باشوورێ کامیرون دبارن.

**٢- هەرێما خولگەی:**

دکەڤیتە باکوور و باشوورێ هەرێما بەرێ ( کەمەری) ، تیرۆژکا رۆژێ ستوونیە و نیمچە ستوونیە پلێن گەرمێ ب درێژاهیا سالێ د بلندن و باران ژی دپرانیا مەهێن سالێدا دباریت ب تایبەتی د مەهێن وەرزێ هاڤینێدا .

**٣- هەرێما بیابانێن گەرم:**

دکەڤیتە باکوورێ هەرێما خولگەی ل نیڤە گویا باکوورێ ئەردی، ل باشوورێ هەرێما خولگەی ل نیڤە گۆیا باشوورێ ئەردی. رادێ بارانێ ژ (٢٥٠ملم) کێمترە و پلا گەرمێ ژ ئەنجامێ ساهیا ئەسمانی پرانیا روژێن سالێ نخافتیە. بلندترین پلا گەرمێ ل ئەفریقیا دڤێ هەرێمێدا دهێتە تۆمارکرن هەر وەسا بلندترین پلا گەرمێ د جیهانیدا دڤێ هەرێمێدا هاتیە تومارکرن کو ٥٨پلا سەدیە ل ویستگەهێ (عەزیزیە) ل وەلاتێ لیبیا سالا ١٩٢٢.

**٤- هەرێما دەریایا ناڤەراست:**

ئەڤ هەرێمە دکەڤیتە باکوور و باشوورێ کیشوەرێ ئەفریقیا . سالوخەتێ ڤێ هەرێمێ بلندیا پلا گەرمێ و هشکاتیە ، ل وەرزێ هاڤینێ و سار وپر بارانیە ل زڤستانێ د ئەنجامدا بەفر دباریت ب تایبەتی ل گوپیتکێن.
چیایێن ڤێ دەڤەرێ ( وەکو بلنداهیێن ئەتلەس ل باکوورێ رۆژئاڤایێ ئەفریقیا )
٥– هەرێما ئاڤ و هەوایێ دەریایا شهدار.
ئەڤ هەرێمە دکەڤیتە بەشێ باشوورێ رۆژهەلاتا ئەفریقیا و وان دەڤەرا ب خوڤە دگریت یێن دکەڤنە سەر زەریایا هیندی. ژ لایێ پلا گەرمێڤە تێکرایێ سالانە دگەهیتە ٥°١٧پلا سەدی ،بەلێ چەندیا بارانا سالانە بترە ژ ١٠٠٠ ملیمەتراو وەرزێ بارینێ جودایە .

چونكو د هندەك بەشادا باران بۆ ماوێ ٦ مەها دباریت،بەلێ هندەك دەڤەرێن دیتر هەنە باران ب درێژیا سالێ دباریت.

### ٦- هەرێما ئەسیوبیا ( حەبەشە):

ئەڤ هەرێمە دكەڤیتە بلنداهیێن رۆژهەلاتای ئەفریقیا ژ بەر بلنداهیا ل سەر ئاستێ روویێ دەریایێ پلا گەرمێ كێمترە ئەگەر گەل دەڤەرێن دەوروبەردا بەراورد بكەین ل ،پلا گەرمیا سالانە ل دەوروبەرێن (١٧°س) یە و د بارێن (١٢٥٠ملم).

## سامانێ ئاڤێ :

### ١- رووبار:

ئەم دشێین رووبارێن كیشوەرێ ئەفریقیا ل لیەی سەمتا چوونێ بكەینە سێ بەش:

أ– رووبارێن درێژنە دەریایا ناڤەراست ، گرنگترین رووبارێن ڤێ دەڤەرێ رووبارێ نیلە كو درێژترین رووبارێ ئەفریقیا یە (٦٧٠٠كم ) ٥ ، ل بانیێن رۆژ هەلاتێ ئەفریقیا دزێت ئەڤ رووبارە ژ باشووری بەرڤ باكووری ڤەدچیت هەتا كو درێژیتە دەریایا ناڤەراست.

ب– رووبارێن د رێژنە زەریایا ئەتلەسی:

گرنگترین رووبارێن ڤێ دەڤەرێ ( رووبارێ كونغۆ و نیجر و ئورەنج و سنغال) ن

جـ– رووبارێن د رێژنە زەریایا هیندی:

ئەڤ كۆمە هژمارەكا رووباران ب خوڤە دگریت ، ئەڤ رووبارە پێكهاتینەژ ( شابالە ، جوبا ، تانا ، رۆڤوما ، زەمبێزی ، لیمپۆپۆ )

### ٢- دەریاچێن ڤی کیشوەری:

پرانیا دەریاچێن مەزنێن ئەفریقیا د کەڤنە بەشێ رۆژهەلاتێ ڤی کیشوەری نموونە ( دەریاچەیـــا مەلاوی ، دەریاچـــا نیاســـا ، دەریاچا تەنجانیقا ، دەریاچا کیڤو ، دەریاچا ئەلبیرت ، ... هتد ) بەلێ یا ژ هەمیا گرنگتر و مەزنتر دەریاچە ( ڤیکتۆریا) یە . ئەڤ دەریاچە ژێدەرێن هندەك رووبارانە .




نەخشێ سامانێ ئاڤێ ل ئەفریقیا

## روومكێ سرۆشتی ل ئەفریقیا :

هەرێمێن رووەكێ سروشتی ل كیشوەرێ ئەفریقیا پێكهاتینە ژ .

١- **دارستانا كەمەری:** دكەڤیتە ل ناڤەراستا ئەفریقیا ، دارێن وێ د چڕ جۆرا و جۆرن ژ رووەكێن هەلاویستی پێكڤە گرێددەن وەكی دارێن ( ساج و لاستیك)

٢- **هەرێما دەریایا ناڤەراست:** ئەڤ هەرێمە دكەڤیتە بەشێ باكوور و باشوورێ ئەفریقیا،دارێن سرۆشتیێن هەرێما دەریایا ناڤەراست هەردەم دكەسكن ،گرنكترین دارێن وێ ( فلین و بەروو وكاژ و سپیندار )

٣- **دارستانا دەڤەرا ئاڤ و هەوای ناڤنجی و گەرم :** چڕیا دارێن وێ كێمترە ب بەراورد لگەل هەرێما دارستانا كەمەری نموونێن دارێن ڤێ هەرێمێ ( خورما روونی و دارا سرخس و هندەك رووەكێن گۆما )

٤- **دارستانا هەرێما ئەسیوبیا:** ژ ئەنجامێ پلا گەرمیا ناڤنجی دارێن وێ ژ دارستانا كەمەری كورتترن و چڕیا وان كمێترە، باشترین دەڤەرە بۆ چاندنا (قەهوە) یێ.

٥- **هەرێما گژوگیایێ ساڤانا:** وەك هەرێما ئاڤ و هەوای خولكەی كو بارانا وێ هاڤینی یە درێژیا ڤان رووەكان د ناڤبەرا (٣-٤م)دایە . وچەند بەرڤ باكوور وباشوور بچن چڕیا وی كێمتر لێدهێت و درێژی كورتترە.

٦- **هەرێما رووەكێ خورستێ بیابانێ:** رووەكێ ڤێ هەرێمێ د كورتن و چڕیا وان كێمە و ب شێوێ سترێدارن ژ بەر هشكاتیا ڤێ دەڤەرێ . ئەڤ رووەكە ب خۆ گونجاندنێ لگەل دەورووبەرێن خۆ بەرگریێ ژ دژواریا ئەوێ ژینگەهێ دكەت. هندەك ژ وان هەردەم كەسك دمینن، و هندەكێن دی پشتی بارانا بارینێ كەسك دبن و دماوەكێ كێمدا زەر دبن و ب داوی دهێن.

## ئاكنجيێن كيشوەرێ ئەفريقيا

هژمارا ئاكنجيێن كيشوەرێ ئەفريقيا گەلەك يا كێمە ئەگەر بهێتە بەراوردكرن لگەل رووبەرێ وێ كو پتره ژ ( ٣٠ مليۆن كم٢ ) ، ئاكنجيێن ئەفريقيا (١٣٪) ژ هژمارا ئاكنجيێن ئەردی پێكدئينن و چريا ئاكنجيبا (٢٧ كەسن د هەر كم ٢ دا ) .

بەلێ ئەڤ چريە نە وەك هەڤە ژ بەر كو پرانيا رووبەرێ ئەفريقيا ( بيابان و ئاڤ و هەوايێ كەمەريە) ب كێر ئاكنجيبوونێ ناهێت . و مەزنترين هژمارا ئاكنجيان ل ولاتێ نايجيريايە كو دگەهيتە ( ١٣٠ مليۆن كەسان ) .

### رڤشتێ ئاكنجيان:

سەبارەت ب ئاكنجيێن ڤی كيشوەری د كنە ( ٤ ) رڤشت.

١- ئاكنجيێن كەڤن (دەسپێكی )

٢- پيست رەش

٣- قەفقازی

٤- حامی

### دابەش بوونا ئاكنجيێن ڤی كيشوەری:

#### ١- دەڤەرا رۆژئاڤايێ ئەفريقيا

ژ ١٧ ولاتا پێك دهێت وەكو ( سنغال ،موريتانيا ، مالی ، نيجەر ، نايجيريا ، غانا ، سيراليۆن و هندەكێن دی) نزيكێ ٣٠٪ ژ ئاكنجيێن ڤی كيشوەری ل ڤێ دەڤەرێ نە.

## ٢- دەڤەرا ناڤەراستا ئەفریقیا:

چریا ئاكنجیێن ڤێ دەڤەرێ یاكێمە ، بتنێ ١١٪ ژ ئاكنجیێن ڤی كیشوەری ل ڤێ دەڤەرێ خۆ جهن.

## ٣- دەڤەرا رۆژهەلاتی ڤی كیشوەری:

رووبەرێ ڤێ دەڤەرێ ٤٠٪ ژ رووبەرێ ئەفریقیا یە، ٢٩٪ ژ ئاكنجیێن ڤی كیشوەری ل ڤێ دەڤەرێ نە.

## ٤- دەڤەرێن باكوورێ ڤی كێشوەری:

ئاكنجیێن كنارێن دەریایا ناڤەراست ب خوڤە دگریت وەكو (مسر ، مەغرب ، جەزائر ، تونس و لیبیا) ، و مەزنترین هژمار ل نهالاێ ( دەلتای نیل ) ە . رێژا ئاكنجیێن ڤێ دەڤەرێ بۆ سەرجەم ئاكنجیێن ئەفریقیا د گەهیتە ٢٣٪ ێ .

## ٥- دەڤەرێن باشوورێ ئەفریقیا:

بەشێن ژێریا ئەفریقیا ب خۆ ڤە دگریت و ب تایبەتی ولاتێ باشوورێ ئەفریقیا كو ٧٪ ژ ئاكنجیێن كیشوەرێ ئەفریقیا تێدا دژین.

## چالاكیێن ئابووری ل كیشومرێ ئەفریقیا:

ئاكنجیێن كیشوەرێ ئەفریقیا هەمی جۆرێن چالاكیێن ئابووری هەنە یێن ژ هەمیا:

### ١- كۆمكرن ونێچیر:

ئەڤ جۆرە چالاكیە نهۆ ل چەند جهێن جودا جودا هەنە وەكی دارستانا خولگەهی ( كەمەری ) ، ل دەڤەرێن كێم ئاكنجی ، وەكی كومەلا بوشمن و بەژن كورتا كو هژمارا وان چەند هزارەكن.

هەر وەسا نێچیرا ماسیا ژی ل ڤی كیشوەری هەیە ب تایبەتی ل كنارێن رۆژ ئاڤای و باكووری، ماسیا هشكری یان قەلاندی خوارنا سەرەكیە بۆ هندەك ژ ئاكنجیێن دەڤەرێن كیشوەرێ ئەفریقیا .

### ٢- خودانكرنـا تەرش و كەواڵی ( شڤانی ):

هەر د كەڤندا ئێكە ژ كارێن مرۆڤێن ئەفریقیا یە و نهۆ بەرەڤ كێم بوونێ ڤە دچیت ، ژ بەر دەركەفتنا چاندنێ ، بەڵێ هۆیەكێ گرنگە بۆ دابینكرنا خوارنێ ل رووبەرەكێ مەزنێ ڤی كێشوەری ، ب تایبەتی دەڤەرێن گژوگیایێ كورتە و دەڤەرێن بیاپانێ.

خودانكرنا جۆرێ تەرش و كەواڵێ ژ دەڤەرەكێ بۆ دەڤەرەكا دی جوداهی هەیە بۆ نمونە حێشتر یا تایبەتە ب بیابانێن ئەفریقی ڤە و پەز و بزن ل باشوورێ ئەفریقیا ژ بۆ بازرگانییێ دهێنە خودانكرن

### ٣- چاندن:

مرۆڤێ ئەفریقیا دان و د كاك ل باكوورێ ئەفریقیا ( ل مەغرب و مسر و ئەسیوبیا) چاندیەب  تایبەتی چاندنا گەنمۆكا و برنجی.

**چاندنا کیشوەرێ ئەفریقیا دو جورە:**

**أ- خۆ ب ژیاندن :** لپرانیا ولاتێن ڤی کیشوەری دهێتە دیتن، وەکی باکوورێ کونغو ، تەنزانیا ، ملاوی ، زامبیا ، لیبیریا ، توغەندا، د ڤی جورێ چاندندا ئامیرێن سادە وپاشکەفتی بکاردئینن.

**ب- چاندنا بازرگانی :** پترپا بەرهەمی ڤی جۆرێ چاندنێ دا بۆ فرۆتنێ بەرهەم دئینن و باشترین رێیا تەکنولوجیا پێشکەفتی بکاردئینن و گرنگترین بەرهەمێ چاندنێ پێکهاتیە ژ دان و دکاك ، و گەنم ، جە ، برنج ، گەنمۆك ، پتاتە ، قەهوە ، کەکەو ، توورتن ، پەمبی.

**٤- پیشەسازی و دەرئێخستنا کانزا :**

پیشەسازی و دەرئێخستنا کانزا ل ئەفریقیا گەلەکا دکەڤن نینە،و تا نهۆ هندەك ژ بەشێن ڤی کیشوەری د دوورن ژ ڤێ چالاکیێ . پێشکەفتنا پیشەسازی لگەل پێشکەفتنا بەرهەمێ چاندنێ و کانزا دیار دبیت ،بەڵێ پشتی سەربخۆبوونا ولاتێن ئەفریقیا وەکی میسر ، جەزائیر ، نایجیریا ، ئەسیوبیا و کۆمارا باشوورێ ئەفریقیا. پێشکەفتنا پیشەسازی دەستپێکر ، و هەبوونا کانزا ل هەر ولاتەکی هۆیەکێ گرنگ بوو بۆ ڤێ پێشکەفتنێ، پرنیا بەرهەمێن ڤی کەرتی بۆ بکارئینانا ناڤخۆییە وەکی ( سابوون ، جگارە ، پیشەسازیێن خوارنێ درستن و چنینێ ) و ژ ئەنجامێ هەبوونا پیشەسازیێ بیاڤێ ئابووری و جڤاکی وان ولاتن هێدی هێدی بەر ب پێشکەفتی ڤە دچیت.

## پشکا ئێکێ
## کیشوەرێ ئەمریکا ئەنگلۆسەکسونی:

### جهێ جوگرافی:

زاراڤێ ئەنگلۆسەکسونی ئێکە ژ زاراڤێن نوی ، کو ل شوونا بەشەکی ژ ( ئەمریکا باکوور ) بکار هاتیە ئەڤ زاراڤە پشت ب جوداهیا شارستانی و ولایەنێ ئاکنجیبوونیا و رەوشا ئابووریا ڤی کیشوەری دگەل کیشوەرێ ئەمریکا لاتینی دبەستیت.

### ١- جوگرافیا سروشتی:-

ژ لایێ جوگرافی ڤە ، کیشوەرێ ئەمریکایا ئەنگلۆسەکسونی ژ هەر چار لاڤە دورو بەرێ وێ ئاڤە ب تنێ بەشەکێ باشوورێ رۆژئاڤای نەبیت کو ب سنۆرێ هشکا تیێ ژ ولاتێ مەکسیکی دهێتە جودا کرن، و نەخشەێ دا کیشوەرێ ئەنگلۆسەکسونی ( وەلاتێ ئەمرکا و کەنەدا) و گزیرتا گرنیلاند ڤەدگریت. و رووبەرێ ڤی کیشوەری پترە ژ (٢٢ ملیۆن کم٢) کیلۆمەترێن چار گۆشە. ئەڤ کیشوەرە ب پلا سیێ دهێت ژ لایێ رووبەری ڤە پشتی هەر دو کیشوەرێن ئاسیا و ئەفریقیا ، هژمارا ئاکنجیێن ڤی کیشوەری ل سالا ٢٠٠١ نزیکی (٣١٦) ملیۆن کەسا بوون.

ژ لایێ ئەسترۆنۆمی ڤە ئەمریکا ئەنگلۆسەکسونی دکەڤیتە د ناڤ بەرا بازنا پانی ( ٢٥°) هەتا ( ٨٣°) ێ باکوورێ گۆیا ئەردی.

### ٢- بلندی و نزمیا روویێ ئەردی :-

بلندی و نزمیا روویێ ئەردی ڤان دیاردێن خارێ بخۆڤە دگریت :-

### أ- زنجيرا چيا:-

زنجيرا چيا دوو بەشن، ئەڤەنە:

**١- بلنداهيێن رۆژهەلاتی ( ئەپەلاشان ) :-**

ئەڤ بلنداهیە ب چیایێن ئەپەلاشان د بەر نیاسن ، دکەڤنە بەشێ رۆژهەلاتاێ ڤی کیشوەری ، ل باکوورێ رۆژهەلاتی بەرەف باشوورێ رۆژ هەلاتی دریێژ دبن ، بلندیا ڤێ زنجیرا چیا زۆر نینە ، تووشی رامالینێن جودا جودا بووینە.

**٢- بلنداهیێن رۆژ ئاڤا ( کوردالیرا ):**

ژ لایێ دروستبـوونـێ ڤە ئەڤ بلنداهیە ژ زنجیرێن ئەپەلاشان نوی ترە، لڤینێن ئەلپی دروست کرینە ، بلنداهیێن دریژان ژ داویا باکووری دگەل کنارێن رۆژ ئاڤای ، دریێژ دبن بۆ باشوورێ ڤی کیشوەری

ئەڤ بلنداهیە ژ چەندین چیا و بانی و نهالا پێکهاتیە، وەکی چیایێن برۆکسی, روکی و ئەلاسکا و کاسکید و سیرانیڤا دا ، بلندترین گۆپیتکا چیایێن وێ ( ماکنلی) یە ، کو بلندیێن یا وێ دگەهیتە نزیکی (٦١٩٦) مەترە لسەر ئاستێ رووێ دەریایێ ، و بانیێن وێ وەکی بانیایێن کۆلۆمبیا و کۆلۆرادۆ، و گرنگترین نهالێ ژی ل ڤان بلنداهیان نهالا مرنێ یە ، کو نزمترین نهالە، (٦٠) مەترا لژێر ئاستی روویێ دەریایێ یە.

### ب- بانی:

بانیا رووبەرەکێ بەرفرەهـ ژ ڤی کیشوەری ڤەگرتیە، یا ژ هەمیان ب ناڤ و دەنگتر، بانا لۆرنسی یە ب ( قەلغانی لۆرنسی ) دهێتە نیاسین کو دکەڤیتە ناڤەراستا باکوورێ روژ هەلاتاێ ڤی کیشوەری . نزیکی نیڤا رووبەرێ کەنەدا پێکدئینیت . ب گشتی بلند یا ڤێ بانیێ ژ ( ١٠٠٠ ) مەترا دەرباز نابیت.

## ج- دەشت :-

دەشت وان زەڤیا بخۆ ڤە دگریت یێن تا رادەکی د راست و بلند یا وان کێم و دبنە دو جۆر:

### ئێک / دەشتێن کەنارێن دەریا:

ب درێژا یا کەنارێن زەریا یا ئەتلەنتی و کەنداڤێ مەکسیکێ ژ باکووری بەرەف باشووری ، درێژ دبن هەتا د گەهنە سنۆری نیڤ دەولتی د ناڤ بەرا ولاتێن ئێککگرتیێن ئەمریکا و مەکسیکێ دا.

ل بەشێ باکووری د تەنگن و چەند بەرەف باشووری بچن بەرفرەهـ دبن ، بلندیا وان ژ (٥٠٠) مەترا نابۆریت ،گرنگترین بەندەرێن ولاتێن ئێککگرتێن ئەمریکا د کەڤینە ڤان کەنارا (نیویۆرك – بوستن– بلتیمور.....هتد)

### ١- دەشتێن هندرێ:

ئەڤ دەشتە د کەڤنە هندرێ (بەشێ ژناڤدا) یێ ڤی کیشوەری تێکرایێ درێژیا وان ژ باکووری بۆ باشووری نزیکی (٤٠٠٠) کیلومەتران د بیت ، و پانیا وان دگەهیتە (١٩٢٠) کیلو مەتران ،بلندا یا ڤان دەشتان دناڤ بەرا (٤٥٠) و پتر ژ (١٥٠٠) مەتران.

## ئاڤ و هەوایێ کیشوەرێ ئەمریکا ئەنگلۆسەکسۆنی :-

ژ بەر هۆکارێن ئاڤ و هەوای ل ڤی کیشوەری ، ئەڤ هەرێمە دهێنە جودا کرن.

### أ- هەرێما ئاڤ و هەوایێ جەمسەری:

ئەڤ هەرێمە پشکا مەزنا باکوورێ ڤی کیشوەری ڤە دگریت . هاڤینا وێ یا کورتە ، و زڤستان یا درێژە و گەلەکا سارە ، پلا گەرمێ ل هندەك جها د گەهیتە (-٣٤°) پلا سەدێ و ژ لایێ بارانێ ڤە ب گشتی باران یا کێمە و بارا پتر ب شێوێ بەفرێ دباریت.

## ب- هەرێما ئاڤ و هەوایێ سار و شهدار:-

دکەڤیتە باشوورێ هەرێما ئێکێ ، رووبەرێ وێ بەرفرەهترە ، هاڤینا وێ درێژترە و زڤستان یا سارە و نزمترین پلا گەرمێ تێدا ( -٣)° پلا سەدێ و پتریا بارانا ڤێ هەرێمێ د هاڤینێ دایە.

## جـ- هەرێما ئاڤ وهەوایێ ناڤنجیێ و سار وێ شهدار:-

ئەڤ هەرێمە بەشێ باشووری رۆژ هەلاتا کەندا و بەشێ باکوورێ رۆژ هەلاتا ولاتێن ئێککگرتیێن ئەمرکا ب خۆ ڤە دگریت . گرنگترین سالوخەتێ ڤێ هەرێمێ زێدەرە و یا گەرمێ ( الطرف حراري ) یە د ناڤ بەرا وەرزێ هاڤینێ و ز ڤستانێ،و تێکرایا باران بارینا سالانە د ڤێ هەرێمێدا دناڤ بەرا ( ٣٨٠ - ١٠٠٠) ملم . و پرانیا بارانێن ڤێ هەرێمێ د وەرزێ هاڤینێ دایە

## د- هەرێما ئاڤ و هەوایێ نیمچە خولگەیێ شهدار:-

دکەڤیتە باشوورێ هەرێما سەری،زڤستانا وێ یا ناڤنجیە ، و هاڤینا وێ گەرمترە ، باران د ڤێ هەرێمێ دا یا زۆرە ، ئەڤ هەرێمە د کەڤیتە ژێر کاریگەریا هر و بایێ خولگەی کو د ڤێ دەڤەرێدا ب (هێرکین ) دهێنە نیاسین.

## ه- هەرێما ئاڤ و هەوایێ کیشوەری:-

ئەڤ هەرێمە هندرێ ڤێ کیشوەری بخۆ ڤە دگریت ، ب تایبەتی دەشتێن ژ ناڤدا ، زێدە رەویا گەرمێ یا بلندە ، هەر چەند بەرەڤ باکوورێ هەرێمێ ڤە بچین پلا گەرمێ نزم دبیت. و هەر چەند ژ روژ هەلاتی برەڤ رۆژ ئاڤی بچین چەندیا باران بارینێ کێم دبیت.

### و- هەرێما ئاڤ و هەوایێ رۆژ ئاڤایێ کیشوەری:-

کەنارێن رۆژ ئاڤا ل ناڤبەرا بازنا پان یا ( ٤٠° - ٦٠°) باکووری ڤەدگریت ، زڤستان یا ناڤنجیە و هاڤین یا هینە ، و باران ب درێژیا سالێ د زۆرن.

### ز- هەرێما ئاڤ و هەوایێ دەریایا ناڤەراست:-

هەرێما دەریا یا ناڤەراست بەشێ باشوورێ رۆژ ئاڤا یێ ولاتێن ئێککگرتییێن ئەمریکا ڤە د گریت ، ب تایبەتی ویلایەتا کالیفورنیا هاڤینا وێ یا گەرم و هشکە، تێکرا پلا گەرمیێ پترە ژ (٢٢)° پلا سەدی و ز ڤستانا وێ سار و بارانیە،

### ح- هەرێما ئاڤ و هەوایێ هشك و نیمچە هشك :-

هەرێما هشك (بیابان) دەڤەرا بانی و گولێن هندرێ بەشێ باشوورێ رۆژ ئاڤایێ ولاتێن ئێککگرتییێن ئەمریکا ڤە دگریت. پلا گەرمێ بەرزە وچەندیا باران بارینێ کێمە.

بەلێ ، هەرێما نیچمە هشك ( سهوب ) بەشێ رۆژ ئاڤایێ دەشتێن ژ ناڤدا ڤە دگریت ، دکەڤیتە رۆژ هەلاتا چیایێن رۆکی ، چەندیا بارن بارینێ ب گشتی یا کێمە . تێکرایێ وێ دناڤ بەرا ( ٢٥٠° - ٤٣٠° ) ملم سالانە. و پتریا وێ د هاڤینێدا دباریت.

#### ٣- دەرامەتێ ئاڤێ :-

کیشوەرێ ئەمریکا ئەنگلوسەکسونی یا دەولەمەندە ب درامەتێ ئاڤێ ، ل ڤێرە ب تنێ دێ ئاماژێ ب ئاڤا سەر ئەردی کەین ( رووبار - دەریاچە ) یێن ل ڤی کیشوەری :

## رووبارێن ڤی کیشوەری:

لسەر ڤان کو مەلێن خارێ رووبار دهێنە دابەش کردن:–

### أ- رووبارێن د رێژنە زەریا یا ئەتلەسی:-

وەك رووبارێ سانت لۆرسی.

### ب- ئەو رووبارێن د رێژنە زەریا یا بەستی یا با کوور و کەنداڤێ هدسن:-

ڤان رووباران ڤەدگریت ( رووبارێ مەکنزی وررووبارێ سەسکجوان ).

### جـ- ئەو رووبارێن د رێژنە زەریا یا هێمن :-

وان رووبارا بخۆ ڤە دگریت ئەوێن بەرەڤ رۆژ ئاڤاي ڤە دچن و درێژنە زەریا یا هێمن ، ئەڤ رووبارە د درێژنینن . و ئاڤ چوونا وان یا بلەزە.

و یێن گرنگ ئەڤە ( روبارێ یوکن ،فریزر ، کۆلۆمبیا ، کۆلۆرادۆ ، سان کینۆ ... هتد )

### د- ئەو رووبارێن درێژنە کەنداڤێ مەکسیك:-

وان رووبارا ڤەدگریت یێن بەرەڤ باشووری دچن و درێژنە کەنداڤێ مەکسیك ،یێ ژ هەمیا گرنگ رووبارێ ریو گراندایە.

## دو/ دەریاچە :

ل ژۆریا کێشوەرێ ئەمریکا ئەنگلۆسەکسونی ژمارەکا زۆرا دەریاچان هەنە، یێن ژ هەمیا گرنگتر ئەو دەریاچەیە یا ب دەریاچەیێن مەزن هاتیە نیاسین.

### أ- دەریاچێن مەزن:

دەریاچێن مەزن د بنەرەتدا ژ ( ٦ ) دەریاچا پێکهاتینە . ئەڤ دەریاچە ب مەزنترین عەمبارا ئاڤێ دهێتە دانان د جیهانێدا ، رووبەرێ وێ نزیکی ( ٢٤٦ ) هزار کیلۆ مەترێن چار گوشەیە. ب رێکا جۆیکێن دەستچێکر دەریاچە پێکڤە دهێنە گرێدان ، رووبارێ سانت لورنس ئاڤا دەریاچا ب زەریا ئەتلەسی ڤە گرێدەت

### ٥- رووەکێ سرۆشتی ( خۆرسکی ):

جۆرا جۆریا رووەکێ سرۆشتی و دا بەش بوونا وێ ب پلا ئێکێ یا گرێدایە ب جۆرێ ئاڤ وهەوایڤە ژ ڤی شێوەی رووەکێ سرۆشتی ل ڤی کیشوەری بۆ ڤان هەرێمێن خارێ دابەش دبیت.

#### أ- هەرێما گژوگیایێ تەندار:

ئەڤ هەرێمە بەشێ باکوورێ کیشوەری ڤەدگریت . گژوگیایێ ڤێ هەرێمێ یێ کورتە و ژیێ وی ژی یێ کورتە ، دو هەتا سێ مەها دژین ، یێ ژ هەمیا ب ناڤ و دەنگتر( کەڤزە). کو چەروانەکێ باشەبۆ ئەو غەزالێن د ڤێ هەرێمێدا دژین.

#### ب- هەرێما دارستانا کاژ ( سنوبەر ):

ئەڤ هەرێمە د کەڤیتە باشوورێ هەرێما تەندرا ، ب کەمەرەکا بەرفرە ژ رۆژ هەلاتی بەرەف روژ ئاڤای درێژ دبیت ، ب تایبەت ژ باشوورێ ئەلاسکا بەرەف باکوورێ ناڤەراستا کەنەدا. ب هەرێمەکا گرنگا دارستانێ دهێتە دانان . بۆ مەبەستا بەرهەمهێنانا دارێن نەرم د جیهانێدا ، کو ژلایێ ئابوری ڤە گرنگە یەکا زۆر هەیە.

## جـ - هەرێما دارستانا تێکەل:

ئەڤ هەرێمە یا تێکەلە ژ دارستانێن کاژان و دارستانێن بەلگ وەریای. دارستانێن کاژان پشکا باکووری ڤێ هەرێمێ ڤەدگریت و دارستانێن بەلگ وەریای پشکا باشووری ڤەدگریت . ئەڤ هەرێمە بەشێ باکووری رۆژهەلاتێ ولاتێن ئێککگرتیێن ئەمریکا ڤەدگریت.

## د- هەرێما دارستانێن بەلگ وەریان : دارێ رەق:

دارستانێن ڤێ هەرێمێ دارێن وان د بەلگ پانن و دار رەقن و بەلگ هەلوەریاینە. دکەڤیتە باشوورێ هەرێما دارستانا تێکەل . ئەڤ جۆرێ دارستانێ ل بەشێ باشوورێ رۆژ هەلاتێ ولاتێن ئێککگرتیێن ئەمریکا هەیە.

## هـ- هەرێما دارستانا رۆژ ئاڤا یێ کیشوەران:

ب باشترین جۆرێ دارستانێ دهێتە دانان ژلایێ چریا داران و جۆرا و جۆر یا دارێن وێ ، بناڤ ودەنگترین دارێن ڤێ دارستانێ دارێ سۆرە ، کو ب مەزنی و بلندی وباشیا دارێ وێ دهێتە نیاسین.

## و - هەرێما دارستانا دمریا ناڤەراست:

دارێن ڤێ دارستانێ هەردەم د کەسکن و بەلگێن وان د پانن ، ژ جۆرێ دار و بارێن کورتن ،و دکەڤیتە ویلایەتا کالیفۆرنیا و گرنگترین دارێن ڤێ هەرێمێ زەیتۆنن دگەل باهیڤان.

### ز - هەرێما رووەكێ گژوگیایێ:

ئەڤ هەرێمە دبیتە دو بەش:

١- هەرێما گژوگیایێ درێژ: کو دەشتێن ناڤەراست ڤەدگریت ،گژوگیایێ وێ ژ جۆرێ ( بەراری ) یە و درێژە.

٢- هەرێما گژوگیایێ کورت: کو ب گژوگیایێ ئەستپس دهێتە نیاسین. ئەڤ هەرێمە دەشتێن مەزن ڤەدگریت.

### ح - هەرێما رووەکێ بیابانانێ:

ئەڤ جۆرێ رووەکی ل ویلایەتێن باشوورێ رۆژئاڤایێ ولاتێن ئێککگرتیێن ئەمریکا بەلاڤەنە. پلا گەرمێ و رێژا هەلمبوونێ یا بلندە ، دگەل بارینا بارانێ رووەك گەلەك لێ شین دبیت و پشتی نەمانا بارانێ هشك دبیت وەکو رووەکێن بیابانا موجاف.

## سێ: جوگرافیا ئاکنجیێن کیشوەرێ ئەمریکا ئەنگلۆسەکسۆنی:

کیشوەرێ ئەمریکا ئەنگلۆسەکسۆنی ب دەڤەرا پێشوازیکرنا لێمشتێن مرۆڤێن جۆرا و جۆر و ئێك ل دویڤ ئێك دهێنە دانان، کو ژ کیشوەرێن ئاسیا و ئەورۆپا و ئەفریقیا دهاتن. دگەل وێ چەندێ هیندیێن سۆر ب ئاکنجیێن رەسەنێن ڤی کیشوەری دهێنە دانان ، ئیسپانی وەك کۆ چبەرێن ئەورۆپای ب ئێکەمین کۆمەل دهێتە دانان کو هاتینە ڤی کیشوەری و ل کالیفۆرنیا و فلۆریدا خۆ جهبووین.ل دویڤدا فرەنسی هاتینە و پاشی بەریتانی... هتد. بەلێ هاتنا رەش پیستن ئەفریقی ب شێوەێ رێیا بازرگانیکرن ب کۆیلا هاتینە ڤی کیشوەری، ژمارا ئاکنجیان ل

سالا ٢٠٠١ د گەهشتە ( ٣١٦ ) مليون كەسا. پيرانيا ئاكنجيا ل ولاتى ولاتێن ئێككگرتيێن ئەمريكا دژين ، كو ژمارا وان پترە ژ (٢٨٤) مليون كەسا، ونزيكى (٣٢)مليون كەسا ل ولاتێ كەنەدا دژين.

ژلايى دابەش بوونا ئاكنجيان ڤە نەرێكيەكا بەرچاڤ ل كيشوەرى هەيە ، بگشتى چرِيا ئاكنجێن كيشوەرى ياكێمە ( ٢٦ كەس / كيلۆمەترەكا چار گوشە) . ئەڤەژى بۆ ڤان هۆكارێن خارێ دزڤريت.

١– درەنگە ئاڤەدانكرنا ڤى كيشوەرى.

٢– دانانا ئاستەنەگ بەرامبەر كوجبەرا.

٣– بجهئينانا شێوازێن كێم زارۆك بوونێ( تحديد النسل )

و رێژا زێدەبونا سالانە يا ئاكنجيان ل ڤى كيشوەرى زورا نزمە رێژە د گەهيتە ( ٠,٥٪ ) . وپترِيا ئاكنجێن كيشوەرى ل بازێران دژين و رێژا وان د گەهتە ( ٧٥٪ ).

## چار / جوگرافيا ئابوورى:

### أ- چاندن

ژ لايێ چاندنێ ڤە وەلاتێن ڤى كيشوەرى دپێش كەفتينە ، ئەڤە ژى بو چەند هۆكارەكا ڤەدگەريت، يێن ژ هەميا گرنگتر ئەڤەنە.

١– بەرفرهيا ئەردێ چاندنێ

٢– گرنگى دان ب چاندنێ بو مەبەستێن بازرگانى

٣– گونجانا رەوشا ئاڤ و هەوا

٤– بكارئينانا ئاميرێن چاندنێ و تەكنۆلۆژيا نوى د بەرهەمهەئينانێدا.

و پەیرەوکرنا لایەنێ زانستییێ چاندنێ بەرپرسە ژ پێشکەفتنا ولاتێن کیشوەری د ڤی بیاڤیدا . زێدەباری بکارئینانـا ئامیرێن چاندنێ یێن پێشکەفتی و بکارئینانـا ژ بلی کیمیایی بشێوەکێ زانستی .. هتد .
گرنگترین بەرهەمێ چاندنێ دڤی کیشوەریدا ( گەنم) ە پاشی ( گنموك ، برنج، بەمبی ، تووتن ... هتد ). ب هەمان شێوە ژ لایێ خودانکرنا تەرش و کەوالی ڤە ل کیشوەری تەرەش و کەوالەکێ زۆر یێ هەی.

## ب- پیشەسازی :

ژ لایێ پیشەسازی ڤە ، ولاتێن ڤی کیشوەری پێشکەفتینە ، بەرهەمێ وان یێ پیشەسازی ل پرانیا بازارێن جیهانێدا دێنە دیتن.
دهێتە خەملاندن کو ولاتێن ئکگرتییێن ئەمریکا و کەندا سێکا بەرهەمێ پیشەسازیا جیهانێ بەرهەم دبینن ئەڤە ژی بو چەند هۆکارەکا د زڤرین یێن ژ هەمیا گرنگتر ( زوریا کەرەستی خاڤێ روەکی – ئاژەلی – کانزایی ) و زوریا دەرامەت و سامانی ( رۆس الاموال )، وزوریا جورێن وزێ ( رەژوو – نەفت– غازا سروشتی – وزا ئاڤێ ... هتد ) .

### گرنگترین پیشەسازی:

د کیشوەرێ ئەنگلۆسەکسۆنیدا دو جورێن پیشەسازیا هەنە :
١– پیشەسازیا دەرئینان ( کو پێکهاتیە ژ دەرهێنانا نەفتی – غازا سروشتی – کانزا سفری .....هتد ).
٢– پیشەسازیا گورێن ( برهەمهێنانا ئامیرێن کارەبێ ، ئاسن و پولا –تۆمبێل ... هتد )

## پرسیار

١- ئەو هۆکار چنە کو کار دکەنە سەر ئاڤ و هەوای کیشوەرێ ئەنگلوسەکسونی؟

٢- ئەگەرێن ئەڤێن خارێ دیار بکە ؟

أ- هەبونا زێدە وێ پلا گەرمێ دناڤ بەرا باکوور و باشوورێ کیشوەریدا.

ب- پێشکەڤتنا چاندنێ ڤی کیشوەری.

٣- هەرێما روەکێ گژوکیای دبتە دوو بەش.



# بەندێ پێنجێ

## پشكا دووێ

## كيشوەرێ ئەمريكا لاتينى:

زاراڤێ ئەمريكا لاتينى ، مەكسيك و ولاتێن ئەمريكا ناڤەراستا و ولاتێن دەريا كاريبى و ئەمريكا باشوور ڤەدگريت .

### ئێك : جوگرافيا سروشتى:-

#### ١- جهێ جوگرافى:-

ئەمريكا لاتينى ژ سێ لايا ڤە ب ئاڤا زەريا و دەريا هاتيە . كەنداڤێ مەكسيك و سنوورێ نێڤ دەولەتيێ ئيگگرتى و مەكسيك سنوورێ باكوورێ كيشوەرى پێكدئينن و زەريا ئەتلەسى دكەڤيتە رۆژ هەلاتێ كيشوەرى ،زەريا يا هێمن دكەڤيتە رۆژئاڤايێ كيشوەرى. ژ لايێ ئەسترۆنومى ، ئەمريكا لاتينى دكەڤيتە دناڤبەرا بازينێن پانى ( ٣٣ ° ) باكوورێ گۆيا ئەردى ، بازنا پانى ( ٥٦°) باشوورێ گۆيا ئەردى.

#### بلندى و نزمياroوويێ ئەردى:

بلندى و نزم ڤان ديارذا ڤەدگريت.

#### أ- چيا :

زنجيرێت چيا ب گرنگترين دياردا بلندى و نزميێ دهێنە هژمارتن ، بلنداهيێن ( ئەنديز ) ژ هەميا گرنگترە ، كو ب ئێك ژ درێژترين زنجيرە چيايێن جيهانێ دهێتە هژمارتن ، كو ژ كەنارێن دەريايا كاريبى دەسپێدكەت و بەرەڤ باشوورێ كيشوەرى درێژدبيت و ژبلێ ڤێ زنجيرێ چەندين زنجيرە چيايێن ل مەكسيكێ و ولايتێن ئەمريكا ناڤەراست هەنە.

## ب - بانی:

چەندین بانی د روویێ ئەردێ کیشوەری دا هەنە ، د پشکا هەرە زور دکەڤنە بەشێ روژ هەلاتێ کێشوەری ، و ژ وان بانیا بەرازیلێ ناڤدارترین و کەڤنترین، ژ بلێ ڤێ بانێ چەندین بانیێن دی ل کیشوەری هەنە وەکی بانیا مەکسیك ، بانیا غیانا ، بانیا بەتە گۆنیا ل ئەرجەنتینێ دا .

## جـ- دەشت:

گرنگترین وبەر فرەهترین دەشتێن ڤی کیشوەری د کەڤنە ئەمریکا باشوور دناڤبەرا بلنداهیێن ئەندیز ل روژ ئاڤا ، وبانیێن (غیانا – بەرازیل – پەتەگۆنیا) ، گرنگترین دەشتێن ژ باکووری بەرەف باشوورێ کیشوەری ئەڤەنە ( دەشتا ئورینکۆ ، دەشتا ئەمەزون ، دەشتا پارانا ، پاراگوای ) .




### ٣- ئاڤ و هەوایێ كیشوەری:

هەرێمێن ئاڤ و هەوایێ كیشوەری دابەشی دبن بۆ :-

**أ- هەرێما ئاڤ و هەوایێ یەكسان :**

ئەڤ هەرێمە دەشتا ئەمازون ڤەدگریت ، پلا گەرمێ د ڤێ هەرێمێدا ب درێژیا سالێ یا بلندە ، و تێكرایێ بارانا سالانە دگەهێتە ( ٢٠٠٠ ) ملم.

**ب- هەرێما ئاڤ و هەوایێ خولگەرێ دەریایی :**

کەنارێن روژ هەلاتێ کیشوەری ڤەدگریت ، تێکرا یێ پلا کەرمێ یا سالانە (٢١°) پلا سەدی کێمتر نینە ، ب درێژیا سالێ هەرێمەکا شهدار و بارنیە

### جـ - هەرێما ئاڤ و هەوایێ (ناڤنجی) یێ شێهدار:

ئەڤ هەرێمە دەڤەرا بلنداهێن دەڤەرا خولگەییێ ڤە دگریت ، وهۆکارێ بلندیا روویێ ئەردی بەرپرسە ژ نزمبوونا پلا گەرمێ ، بەلێ ئەو دەڤەرێن نزم پلا گەرمێ یا بلندە ، ژلایێ بارانێ ژی ڤە چەندیا بارانا ڤێ هەرێمێ دناڤبەرا ( ٧٥٠ – ١٦٥٠ ) ملم دسالێکدا ، ئەڤ هەرێمە بانیێن غیانا و بەشێ باشوورێ بانیا بەرازیلێ ڤەدگریت.

### د- هەرێما ئاڤ و هەوایێ ساڤانا:

دەشتا لانۆس و پتریا بانیا بەرازیلێ و کەنارێن روژئاڤایێ ئەمریکا ناڤەراست ( باشوورێ خولگەی گارك ) ڤەدگرێت ، بارانا ڤێ هەرێمێ هاڤینیە و زڤستانا وێ یا هشکە، تێکرایێ گەرما سالانە د گەهیتە نزیکی ( ٢١°) پلا سەدی ، و برا باران بارینا سالانە دناڤبەرا ( ٦٠٠ – ١٠٠٠) ملم یە.

### هـ - هەرێما ئاڤو هەوایێ ناڤنجی شهدار:

ئەڤ هەرێمە هاڤین و زڤستانا وێ ژ لایێ پلا کەرمێ ڤە ، ناڤنجیە،زێدە بارێ ڤێ چەندێ پلا گەرمێ د هاڤینێدا بەرەف بلند بونێ یە، بتایبەتی ل بەشێ باشوورێ بەرازیلێ ، چەندیا باران بارینێ لڤێ هەرێمێ دا ژ ( ٧٥٠ ) ملم کێمتر نینە، باران د هاڤینێدا د بارن.

### و- هەرێما ئاڤ و هەوایێ دەریایا ناڤەراست:

بەشێ ناڤەراستا ولاتێ شیلی ڤەدگریت کو دکەڤیتە روژ ئاڤا یێ کیشوەری ، زڤستانا وێ ب بارانە و هاڤینن یا هشکە.

### ز- هەرێما ئاڤ و هەوایێ روژئاڤایێ کیشوەری:

ئەڤ هەرێمە بەشێ باشووری ولاتێ شیلی ( باشووری بازنا پانی ( ٤٠° ) باشوور ڤەدگریت ، تێکرا یێ پلا گەرما سالانە یا ڤێ هەرێمێ د ناڤبەرا ( ٥ – ١٥ )° پلا سەرییە ، وچەندیا باران بارینا سالانە ژ ( ١٠٠٠ ) ملم بترە.

### ح- هەرێما ئاڤ و هەوایێ تەندرا و بلنداهیێن ئەندیز:

هەرێما تەندرا رووبەرەکێ بچووك ژ کیشوەری ڤەدگریت،کو دکەڤیتە داویا باشوەرێ کیشوەری ل باشوورێ بازنا پانی ( ٥٠° ) ی باشوور، و پەشەك ژ بلندایێن ئەندیز ژ تێکرایێ پلا گەرما وەرزی کەرمێ ژ ( ١٠°) پلا سەدی دەرباز نابیت ، و چەندیا باران بارینێ ل ڤێ هەرێمێ یا کێمە ، سالانە ژ (٢٥٠) ملم نابۆریت.

### ی- هەرێما ئاڤ و هەوایێ هشک و نیمچە هشک:

ئاڤ و هەوایێ هشك ( بیابان ) بەشێ باکوورێ روژ ئاڤایێ مەکسیکێ وباکووری بانیا مەکسیك و باکوورێ شیلی و باشوورێ ولاتێ پیرو ( بیابانا پیرو و بیابانا ئەتاگاما ) شیلی ڤەدگریت، ناڤەندا باران بارینا سالانە ژ ( ٤٢٥) ملم کێمترە ، و پلا گەرمێ دناڤبەرا ١٥ – ٢١° پلا سەدییە.

هەرێما ئاڤ و هەوایێ نیمچە هشك ( سهوب ) بشێوێ كەمەر یێ تەنگ كەنارێن فەنزویلا و شانی بەرازیل و باینا بەتەگۆنیا ڤەدگریت . وچەندیا باران بارینێ ل ڤێ هەریمێ سالانە د ناڤبەرا ( ٢٥٠ - ٦٥٠ ) ملم دایە.

**٤- دەرامەتێ ئاڤێ :**

كیشوەرێ ئەمریكا لاتینی ژ لایێ دەرامەتێ ئاڤێ ڤە ب ئێك ژ كیشوەرێن دەولەمەند دهێتە هژمارێن.

**ئێك / رووبار:**

مەزنترین هێل بەلاڤبونا ئاڤی ل كیشوەری د كوپیتكێن زنجیرا چیایێن ئەندیز و چیایێ باس و سـیرامـادێرا روژ ئاڤێ دبوریت د شیاندا هەیەرووبارێن ڤی كیشوەری بكەینە سێ بەش:-

**١- ئەو رووبارێن بەرەف روژهەلاتی ڤە دچن و درێژێنە زەریایا ئەتلەسێ:**

ئەڤە كۆمەكا رووبارێن مەزن و ب ئاڤن و ژ هەمیا ناڤدارتر ئەڤەنە.

أ- رووبارێ ئەمازون.

ب- رووبارێ پارانا - پاراگوای.

جـ- رووبارێ ئورینكو.

**٢- ئەو رووبارێن درێژێنە زەریایا هێمن:**

ئەڤ كۆمەلا رووبارا دكەڤنە بەشێ روژ ئاڤایێ كیشوەری ، كو دەشتێن كەنارێن روژئاڤای د برن و درێژنە زەریایا هێمن. ئەڤ كۆمەلا رووبارا د كورت و بلەزن و هندەك ژ وان وەرزی نە، یێن ژ هەمیا ناڤدارتر رووبارێ گراندی سانتیاگۆ ، رووبارێ باساس ل مەكسیكێ .

**٣- ئەو روویبارێن درێژنە دەریایا كاریبی:**

وان رووباران ڤەدگریت یێن درێژنە دەریایا كاریبی،ئەو رووبار د كورتن و درێژیا وان دناڤبەرا (١٥٠ - ١٥٠٠) كم ، یێن ژ هەمیا ناڤدارتر رووبارێ

(ساند جوان – ئوتراتو – ماگدالینا ) نه ئەڤ رووباره ژ زنجیر چیایێن ئەندیز ڤه دزوێن.

**دو/ دریاچه :**

لسەر رووبێ ڤی کیشوەری چەند دەریاچه تێنه دیتن کو یێن ژ هەمیا ناڤدارتر ئەڤەنه:-

١– دەریاچه ماراکیبو.

٢– دەریاچه تیتی کاکا.

٣– دەریاچه دی پو پو .

**٥- رووەکێ خورست:-**

رووەکێ خورستی ل ڤی کیشوەری بۆ ڤان هەرێمێن خارێ دهێته دابەش کرن

**١- هەرێما دارستانا خۆلگەییا ب بارانی ( دارستانا سلڤا ):**

دارستانێن ڤێ هەرێمێ رووبەرەکێ بەرفرهه ژ ڤی کیشوەری دگرن و وارێن وێ ب درێژیا سالێ د کەسکن و چریا وان زوره بەلکێن وان دپانن و جورا و جورن و د بلندن ، ئەڤەژی ڤەدگەریت بو بلندی پلا گەرمێ و بارانا زور د ( ئاڤ و هەوایێ یەکسانی) ڤ دارستانه ئەمازۆن و کەنارێن روژ هەلاتێ کیشوەری د ناڤبەرا بازنا پانی (٢٠°) باکورر هەتا (٣٠°) باشوور و کەنارێن روژ ئاڤایێ کیشوەری ڤەگرتینه ، دارا ( لاستیك، کاکاو ، عاج ، مۆز ، دار خورما )گرنکترین دارێن ڤێ هەرێمێ نه.

### ٢- هەرێما دارستانا وەرزی:

ئەڤ دارستانە برانیا گزیرتێن هندا روژ ئاڤا و کەناری پاسفیکی ل ئەمریکا ناڤەراست و باشووری روژهەلاتا بەرازیلێ د روژ هەلاتا پاراکوای نخافێت . لێ دارێن ڤێ هەرێمێ د کورتن وجورا جور یا وان ژی کێمترە ئەگەر بەراور د بکەین دگەل دارێن هەرێما ئێکی

### ٣- هەرێما دارستانا ستردارێ:

دارستانێن هەرێمێ دەڤەرێن خولکەی ڤی کیشوەری ڤەدگریت ، کو هاڤینا وان هشك و ب درێژە دارستانێن وێ ل ڤان جها د بەلاڤن ( باکووری روژ هەلاتا بەرازیلێ و دەشتا جاکو و باشووری روژئاڤا مەکسیکێ و هندەك ناڤنچێن دی ل ئامریکا ناڤەراست ( کوبا د جامایکا ) ،دارێن ڤێ هەرێمێ پێکهاتیە ژ دار و بارێن سترێدارێن یین کورت ، کو بەرگریا هشکاتیێ دکەن ، ل هندەك جها دکەل رووکی گژوگیایێ بلند تێکەل دبن .

### ٤-هەرێما داستانا تێکەل:

دارستانا ڤێ هەرێمێ تێکەلە ژ دارێن هەردەم کەسك و بەلگ پان ، دگەل دارێن بەلگ وەرین ژ لایەکی ڤە و دارێن کاژان ژ لایەکی دی ، ئەڤ جورێ دارستانێ ژی ل بەشێ باشووری بانیا بەرازیلێ هەتا ولاتێ ئوروکوانێ درێژ دبن.

### ٥- هەرێما دارستانا ناڤنجی بارانی:

ئەڤ دارستانە ژ ولاتێ شیلی دەسپێدکەت و دگەل کەنارێن روژ ئاڤا درێژ دبیت د ناڤ بەرا بازنا پانی ( ٤٠ °– ٥٤°) باشوور، دارێن هەرێمێ ب درێژیا سالێ کەسکن.

## ٦- هەرێما دارستانا دەریایا ناڤەراست:

دارێن ڤێ هەرێمێ ب دەرێژیا سالێ د کەسکن ، بەلگێن وان پانن ، ل ناڤەراست ولاتێ شیلی دهێنە دیتن.

## ٧- هەرێما گژوگیایێ خولگەی:

ب هەرێما (ساڤان) دهێنە نیاسین ، دوو جۆر هەنە ساڤانا هشك و ساڤان شێهدار ، جۆرێ ئێکێ دکەڤیتە پرانیا روویێ بانیا بەرازیلێ، بەلێ جۆرێ دوێ دکەڤیتە گۆلا رووبارێ ئۆرینکو ، بەشێ باشوورێ روژئاڤایێ بەرازیلێ ، بەشەك ژپاراکوای ، ئەڤ هەرێمە ل بەرازیلێ ب (کامبوس) دهێتە نیاسین و ل گۆلا ئورینکو ب ( لانۆس ) دهێتە نیاسین.

## ٨- هەرێما گژوگیایێ ناڤنچی:

گژوگیایێ ڤێ هەرێمێ د نەرمن ، ل وان جها شین دبن یێن هاڤینا وان یا گەرم و زڤستان یا ناڤنجی، ب هەرێما (پەمپاس) دهێنە نیاسین ، دکەڤیتە دەوروبەرێن پایتەختێ ئەرجەنتین (بۆینس ئایرس)، روبەرێ وێ نزیکێ نیڤ مەلیون کیلومەترین چار گوشە د هێتە خەملاندن.

## ٩- هەرێما گژوگیایێ ئەستەبس د رووەکێ بیابان:

گژوگیایێ ئەستێپس ل بانیا بەتەکونیا و باکوورێ روژ ئاڤایێ ئەرجەنتینێ و کنارێن ڤەنزویلا و هندەك ناڤچێن دیترێن جودا جودا شن دبیت ، گژوگیایێ ئەستەبس د کورتن ، بەلێ رووەکێ بیابانێ ل باکوورێ روژئاڤایێ مەکسیکێ و باکوورێ بانیا مەکسیك و کەنارێ زەریایا هێمن ل کنارێن پیرو و باکوورێ شیلی شیندبن ، دناڤبەرا بازنا پانی ( ٦° – ٣٠° ) یا باشوور.

## دو / ئاكنجيێن كيشوەرێ ئەمريكا لاتينى :

ئاكنجيێن رەسەنێ ڤى كيشوەرى هينديێن سوورن،كو ژ ناڤەراستا ئاسيا ڤە هاتينە ڤى كيشوەرى ، پاشى نڤشێن دى بەر ب ڤى كيشوەرى چووينە .

(٣٣٪) ژ ئاكنجيين وێ ل ولاتێ بەرازيل دروێنن كو (١٧٢) مەليون كەسن، پاشى ولاتێ مەكسيك دهێت، كو ژمارا ئاكنجيێن وێ ل سالا ٢٠٠٠ ز نزيكى ( ١٠٠ ) مەليون كەسن بوون ل سالاْ ٢٠٠١.

تێكرايا گەشەكرنا سالانە يا ئاكنجيين ڤى كيشوەرى يا بلندە دگەهيتە نزيكێ (١,٧٪) .

ژ لايى دابەشبونا ئاكنجيانڤە نەرێكيەكا ل ڤى كيشوەرى بەرجاڤ هەيە، و ژلايى چريا ئاكنجييان ڤە، چريا ئەكنجييا ل ڤى كيشوەرى د كەهيتە نزيكى ( ٤١ كەسا / كم٢ ).

پرانيا ئاكنجيين ڤى كيشوەرى ل باژێرا دژين ،رێژا ئاكنجيين باژێرا ل ڤى كيشوەرى ل سالا ٢٠٠١ ز (٧٤٪) يە .

## سێ / چالاكى ئابوورى:

كيشوەرێ ئەمريكا لاتينى دەولەمەندە ب دەرامەتێ سروشتى و ئابوورى ، وەك هەبوونا چەندەكا زۆر ژ زێدەرێن و وزێ ( نەفت ، گازا سروشتى ، دوزا كارەبێ ... هتد ).

## چالاكيێن ئابــــووری ژی ئەڤـــــەنە:-

### أ- چاندن :

ژلایێ چاندنێ ڤە ولاتێن ڤی کیشوەری ب گشتی پاش کەڤتینە ، زێدەباری هەبوونا چەند هەرێمێن پێشکەڤتی وەکی هەرێما پەمپاس ل ئەرجەنتینێ، دگەل ڤێ چەندێ ژی رێژەکا زۆر ژ ئاکنجیین وەلاتێن ڤی کشوەری مژوولی چاندنێنە وەك (پاراکواتی، پۆلیڤیا ، هایتی کواتیمالا......هتد) ، وهەتا رادەیەکا دبەستن زۆر ئابوورێ ڤان. ولاتا پشت ب داهاتێ چاندنێ ، ب هەردولایە (رووەکی ئاژەلی) ڤە و گرنگترین ئەودرامەتێن کو دهنێرنە ژ دەرڤە ئەڤەنە( کەنم، گەنموك،) ، مۆز قامیشێ شەکر ، پەمبی ، قاوە.....هتد)

### ب - پیشەسازی:

ولاتێن ڤی کشوەری ژلایێ پیشەسازێڤە ژ ولاتێن پێشکەفتی دهێنە هژمارتن. دگەل هندێ ژی جوداهیەکا بەرچاڤ ل ژمارا و جۆرێ پیشەسازیان دناڤبەرا ولاتێن ڤی کیشوەریدا هەیە، و پرانیا ئەو پیشەسازیێن هەین پیشەسازیێن دەرئینانا ( استخراجي ) تە، پیشەسازیێن د سنکن کو هەتا رادەیەکی پێدڤیێن ژیارا رۆژانە بۆ وان بازارێن مەزنێن هەین دابین دکەن ، ژ ئەنجامێ زۆریا ژمارا ئاکنجیێن بازێران ، و هەبوونا وان پیشەسازیان هەتا رادەیەکێ زۆر ب هەبوونا کەرستێ خاڤە . چونکی کیشوەر وێ دەولەمەندە ب جورا جوریا کەرستێ خاڤێ کانزایی و رووەکێ و ئاژەلی ، زێدەباری بەرفرەهبوونا بازاران و هەبوونا ژێدەرێن وزێ یێن جۆرا و جۆر ، گرنگترین کەرستێن خاڤ ( نەفت ، گاز سروشتی ، ئاسن ، ماميشێ شەکر و پەمبی و بەر هەمی ئاژەلی ... هتد )

## پسيار

١- دبيژنه كويرێ ئەمريكا لاتينى ؟

٢- بوچى بانيا بەرازيلێ ناڤدارترين بانيين ئەمريكا لاتينيه؟

٣- ئەو هۆكارێن كو كاردكەنه سەر ئاڤ و هەوايێ ئەمريكا لاتينى چنه؟

٤- ئەمريكا لاتينى ب دەرامەتێ ئاڤێ دەولەمەندە بوچى؟

٥- بەلگێن دارستانێن خولگەيى بارانى دپان و جۆرا و جۆرن ، بوچى؟

٦- هەرێمێن رووەكێ خورستى ( سروشتى ) يێن ئەمريكا لاتينى بژمێره؟

٧- هەرێما گژوگيايێ خولگەيى ب هەرێما ( ساڤانا) دهێته نياسين ، دو جۆر هەنه، بژميره .

## سروشتێ ئوستراليا

کیشوەرێ ئوسترالیا بچوکترین کیشوەرێ جیهانی یە ب تمامی کەڤیتە نیڤا باشوورێ ئەردی ، رووبەرێ وی دگەهیتە ٧,٦ کم٢، ژ هەمی لایاڤە ئاڤە، زەریایا هێمن ل رۆژ هەلاتی و باکوورێ رۆژ هەلاتی ،زەریایا هیندی ل رۆژ ئاڤای و باکوورێ رۆژ ئاڤای.

ژ لایێ ئەسترۆنۆمی ئوسترالیا دکەڤتیە ناڤبەرا بازنا پانی ١١ – ٤٤° باشووری ڤە هێلا درێژی ١١٢ – ١٥٣ رۆژ هەلات . خەلگەی کاژولە دناڤەراستا کیشوەریدا دەربازبیت، ماوێ دنلڤبەرا بەشی باکوور و باشوور دگەهیتە ٣٨٦٢ کم. کیشوەرێ ئوسترلیا هەتا رەدەیەکی ئیك پاچە پیکڤە دیارە.

ئوسترالیا ژ لایی ئیداریڤە (٨) ویلایەتا پێکدێت ، ئەڤ ویلایەتە ژ پێکهاتێنە ژ :



١- کەرتێ باکوور.

٢- ئوسترالیا باشوور.

٣- ئوسترالیا ڕوژ ئاڤا.

٤- کوینزلاند.

٥- نیوساوث ویلز.

٦- فیکتۆریا .

٧- تەسمانیا .

٨- کەرتی پایتەختی ئوسترالیا ( کانبیرا ).

## پێکهاتێن سەر ڕووێ ئەردی ( بلندی و نزمی )

ژ لایێ پێکهاتیێن سەر ڕوویێ ئەردی کیشوەرێ ئوسترالیا بۆ سێ پشکا د هێتە دابەش کرن ئەوژی ئەڤەنە:

### ١- بانیا ڕوژ ئاڤا :

نزیکی ٤٥٪ یێ ژ ڕووبەرێ ئوسترالیا ڤە دگرێت و دکەڤیتە بەشێ ڕوژ ئاڤای ئوسترالیا.

### ٢- دەشتێن ئاڤەراست ( ئەردێن نزم ):

ئەڤ بەشە د کەڤیتە د ناڤبەرا بلندایێن ڕۆژ هەلاتی ژ لایەکی ڤە و بانیا ڕۆژ ئاڤا ژ لایەکێ دی ڤە.

**زەڤیێن نزمێن ناڤەراستا ئوسترالیا بە شیوەیەکی گشتی دکەنە سێ بەش:**

أ- ئاڤ زیلا کەنداڤێ کەربنتاریا ل باکوور.

ب- ئاڤ زیلا ئیرتوازیا مەزن.

جـ- ئاڤ زیلا ڕووبارێ میری - دارلینگ.

سروشتی ڤی بەشی و پیکهاتا وی چولوچیا وێ وێ وەگریە کو ئەڤ بەشە ب ئاڤا ژێر ئەردی و بیرێن ئیرتوازی زۆرێ دەولەمەند بیت.

### ٣- بلنداهێن روژهەلاتی:

ئەڤ بەشە دکەڤیتە روژ هەلاتێ ئوستراليا و نیزیکی ١٤٪ ژ رووبەرێ ئوستراليا ڤە دگریت.

## ( ئاڤ و هەوایێ کیشوەرێ ئوستراليا )

## ( هەرێمێن ئاڤ و هەوای )

کیشوەرێ ئوستراليا ژ لایێ ئاڤ و هەوایڤە دابەش دبیتە سەر چەند هەرێمەکا،ئەڤ هەرێمە ژی پێکهاتینە ژ:

#### ١- هەرێما ئاڤ و هەوایێ دەریایا ناڤەراست:

بەشێ باشوورێ روژ ئاڤایێ ئوستراليا و بەشی باشوورێ روژ هەلاتی (روژ ئاڤایێ ويلايەتا فيكوريا) ڤەدگریت ،

ب شێوەکی گشتی هەرێمەکا هین و خوشە ،چەندیا باران سالانە ل ناڤبەرا ( ٥٠٠ – ٧٥٠ ) مليمەتراندایە و وەرزێ دا بارینێ دکەڤیتە د زڤستانێدا ، بەلێ وەرزێ هاڤینێ بتمامی یێ هشکە. تێکرایێ پلا گەرمێ دڤێ هەرێمێدا د گەهیتە ( ٢٢ ) پلا سەدی د وەرزێ هاڤیندا ئو (١٠) پلا سەدی د وەرزێ زڤستانێ.

#### ٢- هەرێما ئاڤ و هەوایێ بیابانێ :

پاناهییەکا زورا مەزن ژ کیشوەرێ ئوستراليا ڤە د گریت کو دکەهیتە (٤٠٪) ی رووبەرێ وی ئەڤ هەرێمە ب وێ چەندێ تێنە نیاسین کو پلا کەرمێ تێدا هەردەم یا بلندە و باران رۆر کێم لێ دبارن.

ئەڤ هەرێمە دکەڤیتە ناڤەراستا کیشوەرێ ئوسترالیا بەرەڤ بەشێ روژ ئاڤا درێژ دبیت هەتا سەر کەنارێت زەریایا هندی ، تێکرایێ بارانێت سالانە د ڤێ هەرێمێدا ژ ( ٢٥٠ ) ملیمەترا کێمترە.

**٣- هەرێما ئاڤ و هەوایێ وەرزی:**

روژ هەلاتێ ویلایەتا کوینزلاند ڤەت گریت ، پلا گەرمێ ب درێژیا سالێ یا بلندە ، تێکرایێ پلێن گەرمێ د ناڤبەرا ( ٢٥ – ٣٠° س ) دایە ، باران د وەرزێ هاڤینێ د بارن ، سەرجەمێ بارتا سالانە د ڤێ هەرێمێدا پترە ژ ( ١٥٠٠ ) ملیمەترا ، لێ هندی بەرەڤ روژ ئاڤای ڤە بچین رادێ باران سالانە بەرەڤ کێمبونێ ڤەدچیت.

**٤- هەرێما ئاڤ و هەوایێ ناڤنجی شهدار:**

بەشێ روژ هەلاتێ ویلایەتا نیوساوث ویلز ڤە دگریت ، تێکرایێ پلا گەرمێ ل وەرزێ زڤستانێدا ناڤنجی یە و دگەهیتە (١١° س) ، لێ ل وەرزی هاڤینێدا بلند دبیت بۆ (٢٢° س). سەبارەت بارانێ بایێ بازرگانی ل باشوورێ روژ هەلات کو ل سەر زەریایا هێمن رادبیت بەرەڤ ڤێ هەرێمێ ڤە دهێت و ب درێژیا سالێ دبیتە ئەگەرا باران بارینێ.

**٥- هەرێما ئاڤ و هەوایێ خەلکەی نیمچە هشک:**

وەکی هیلالێ (هەیڤەکا نە تەمام ) دکەڤیتە دۆر ماندورێ هەرێما ئاڤ و هەوایێ بیابانێ ژ باکوور و رۆژ هەلات و باشرور ، پلا گەرمێ ب درێژیا سالێ هەتا رادەکی بلندە ب ئاوایەکی کو جوداهیا پلێن گەرمێ د ناڤبەرا هاڤین و زڤستاندا

ژ ( ۱۰ – ۱۵ °س) دەربازنابیت ، رادێ باران بارینا سالانە دگەهیتە ( ۱۳۰۰ ) ملیمتران .

## ( سامانێ ئاڤێ )

کەفتنا ئوستralیا دناڤبەرا بازنا پانی ( ۱۱ – ٤٤ °) باشوور و نەبوونا زنجیرە چیایێن بلند ، بوویە جهێ کێمیا رێژا باران بارینێ ب شێوەکێ گشتی ، هەر چەندە جوداهیەکا بەرچاڤ دناڤبەرا بەشێن جودا جودا یێن کیشوەری ئوستralیا دا هەیە ، بۆ نموونە ڤەگەر ب هووری ل نەخشێ سروشتییێ کیشوەرێ ئوستralیا بنێرین دێ زۆر رووبارا ل دەڤەرێن کەناری بینین ، لێ رێژا هەرە زورا ژ رووبارا پشتی وەرزێ باران بارینێ پڕن ئاڤ دبن و پشتی دەمکێ کێم هشك دبن ، نموونە بو ڤان رووبارا وەکی رووبارێ فیتزۆری و ڤیکتۆریا ل باکوورێ ئوستralیا و رووبارێ کلارنسێ و ریچموتدا ل روژ هەلاتێ ئوستralیا. رووبیارێ میرێ . دارلینگ ب گرنگترین رووبارێن ئوستralیا دهێتە هژمارتن ،رووبەرێ گۆلا وێ دگەهیتە ۷۰۰ هزار کم۲ ، میرێ – دارلینگ تنێ رووبارە کو ب درێژیا سالێ ئاڤ ژێ ناهێتە برین و ژلایێ ئاکنجیان ڤە بو کارو جارێن گشتوکالی و ئاژەلداریێ دهێنە بکارئینان.

ژبلێ ئاڤا سەر ئەردا کیشوەری ، چەند ئاڤ زێلێن ئاڤا ژێر ئەردێ ل ئوستralیا ژێ هەنە، یێن ژ هەمیا گرنگتر ئاڤ زێلا ئیرتوازیا مەزنە ، کو رووبەرێ وێ دگەهیتە زێدەتر ژ ئێك ملیون کیلومەترێن چارگوشە ، ئاڤا وێ هەتا رادەکی یا سویرە ، بو هەمی چالاکیا دەیت نادەت و بو ئاڤدانا تەرش و کەوالی دهێتە بکارینان ، ئەڤە و (۲۰٪ ) ێ ژ تەرش و کەوالێ ئوستralیا ب ئاڤا ژێر ئەرد تێنە تێرکرن .

## جوگرافیا مرۆڤی ئوسترالیا :

دیرۆکا ڤەدیتن و ئاکنجیبوونا ئەورۆپیا ل کیشوەرێ ئوسترالیا کەلەك کەڤن نینە ، لێ ئەڤە وێ رامانێ نادەت کو ئەڤ کیشوەرە بەری بهێتە ژ لایێ ئەورۆپیا ڤە جهێ ئاکنجیبوونا خەلکەکێ دیتر نەبوو ، و ژ گرۆڤێن مێژوویێ وێ چەندێ د سەلمێن کو کیشوەرێ ئوسترالیا ژ لایێ مرۆڤان ڤە بوویە جهێ ئاکنجیبوونێ ، ئەڤەژی بو دوازدە هزار سالا بەری نهو دزڤریت ، و بەردەوام ژیان تێدا هەبوویە هەتا نهو ، هەتا سالا ١٧٨٨ ێ ئوسترالیا بتنێ ژ لایێ ئاکنجیێن رەسەن ڤە خو جهبوویە کو بۆ رڤشتێ ملایوێ یان ئەندەنوسی ڤەدگەرن ، هژمارا وان ل دەسپێکا گەهشتنا ئەورۆپیا بو ئوسترالیا ب (٣٠٠) هزار کەسان د هاتیە خەملاندن و جهێ خو ئاکنجیبوونا وان کەفتبو کەنارێن روژ هەلاتێ ئوسترالیا و پشکەکا دی ل بەشێن باکوورێ دخو جهبوون .

گەهشتنا ئەورۆپیان بو کیشوەرێ ئوسترالیا چەند ئەنجامەك لسەر ئاکنجیێن رەسەن پەیداکرن ، بڤی شێوێ خارێ دیار:-

١- دوبارە داشبوونا جوگرافیا ئاکنجیێن رەسەن :- چونکی ئەورۆپی ل دەسپێکێ دا ل بەشێن روژ هەلاتی خو جهبوون کو ئەڤە ژی بوویە ئێخستنا فشارێ لسەر ئاکنجیێن رەسەن و دەرێخستنا وان بۆ دەڤەرێن ژ ناڤدا و باکوورێ ئوسترالیا . نهو ئەو چڤاکێ.

رەسەن لە کەرتێ ئوسترالیا باکوور و باکوورێ کوینزلاندو باکوورێ ویلایەتا ئوسترالیا رۆژ ئاڤادایە.

**٢- بەردەوام نزمبونا هژمارا ئاکنجیێن رەسەن:-**

وەکو مە ئاماژە بۆ کری هژمارا ئاکنجیێن رەسەنێن ئوسترالیا ل دەسپێکا گەهشتنا ئەورۆپیا نزیکی (٣٠٠ ) هزار کەسا بوون. لێ نهۆ ژمارا وان (٥٠) هزار کەسا نابوریت ، زێدەبارێ ئەوێ چەندێ کو ئاکنجیێن رەسەن ل گزیرت تەسیمانیان ب ئیکجاری نەمان و هاتنە برانەن .

**( زێدەبوونا ژمارا ئاکنجیێن و کۆچبەران بۆ کیشوەرێ ئوسترالیا )**

| سال | ژمارا ئاکنجیان | ژمارا کوچبەران | تێکرا سالانە یا کوچبەران |
|---|---|---|---|
| ١٧٨٨ | ١.٠٢٢ | ـــــــ | ـــــــ |
| ١٨٥٠ | ٤٠٥.٣٥٦ | ٣١٧.٠٠٠ | ٥.١١٣ |
| ١٩٠٠ | ٣.٧٧٤.٣٥٥ | ٧٦٣.٩٨٩ | ١٩.١٠٠ |
| ١٩٣٠ | ٦.٥٠٠.٥٧١ | ١٨٣.٢٤٥ | ٢٠.٣٦١ |
| ١٩٤٠ | ٧.٠٦٨.٦٨٩ | ٣١.٢٤٢ | ٣.١٢٤ |
| ١٩٥٠ | ٨.١٣٦.٠٠٠ | ١٥٣.٦٨٥ | ١٥.٣٦٨ |
| ١٩٦١ | ١٠.٣٩٨.١٧٠ | ١.١١٥.٩٨٠ | ١٠١.٤٥٣ |
| ١٩٧١ | ١٢.٧٢٨.٠٠٠ | ١.١٥٤.٨٤٠ | ١١٥.٤٨٤ |
| ١٩٧٨ | ١٤.٢١٢.٩٠٠ | ٨٧٥.٠٠٠ | ١٢٥.٠٠٠ |
| ١٩٨١ | ١٤.٧٢٠.٣٠٠ | ـــــــ | ـــــــ |
| ٢٠٠٣ | ١٩٧٣١.٩٨٤ | ـــــــ | ـــــــ |

## گەشەکرنا ئاکنجیان ل ئوستراليا و دابەش بوونا وان:

ژمارا ئاکنجیێن ئوستراليا ل سلا ٢٠٠٤ گەهشتە نزیکی ٢٠ مليۆن کەسا ، پیستی سپی ٩١٪ و پیستی زەر ( ئاسیەوی ) ٧٪ ی ئاکنجیان دئینن . ئەڤ بارودووخە ژ ئەنجامێ دوو هۆکارانە:

١- دیشن و دەست ب سەر داگرتنا ڤی کیشوەری ژ لایی بریتانیا ڤە و خو جهبوونا بریتانیا ب تایبەت و ئەورۆپیا شێوەکێ گشتی تیدا.

٢- پەیرەوکرنا سیاسەتا ئوستراليايا سپی ، ئەوژی ب دەرگەه بۆیێن پیست سپی ڤەکرن و ئاستەنگ بۆ کۆمەلێن دیتر دانان

ئوستراليا ژ بەر کێمیا ژمارا ئاکنجیان و مەزنا رووبەری چریا ئاکنجیێن وێ کێمە، و دڤی بیاڤیدا ئەم شێین بێژین چریا ئاکنجیان ل سەر ئاستێ کیشوەرێن جیهانێ کێمترین چری تێدایە کو ژ ٢,٦ کەسا بۆ ئێك کیلومەترێ دەربازنابیت، ل دەمەکیدا چریا ئاکنجیا د گەهیتە زیدەتر ژ (٧٠) کەسا / کم٢ ل ئەورۆپا و (٨٥) کەسا / کم٢ ل ئاسیا ئەڤەژی دزڤریتە بو :

١- زێدەتر ژ (٨٧٪) رووبەرێ ئوستراليا ژ ناڤچا بیابان و نیمچە بیابان پێکدهێت کو باران زور کێم لێ دباریت و پلا گەرمێ یا بلندە ، کو ئەڤە ژی هاریکار نینە کو خەلك کۆ چێ بۆ بکەت و لێ ئاکنجی ببیت

٢- ئاستەنگ ئێخستنە بەر کۆچکرنێ بۆ هەمی ئەوان کەسێن کو ب رڤشتی پیست سپی نینن بۆ ڤی کیشوەری.

## ( ئاكنجيێن باژێرو گوندا )

رێژا ئاكنجيين باژێران كيشوەرێ ئوستراليا بەردەوام بلندبويە ، و سالٌ پشتی سالێ ئەڤ رێژە بلندتر لێدهێت سەر كيسێ رێژا ئاكنجيێن گوندا، ل سالا ۲۰۰۱ز دا رێژا ئاكنجيێن باژێرا ل ئوستراليا ۹۱٪ بوو و ئاكنجيێنگوندا ۹٪بوو.

لێ ژبەر كو ئوستراليا ژلايێ ئەوروپيا ڤە هاتيە ئاڤەدان كرن و ئاكنجيكرن، دبينن رێژا دابەشبوونا ئاكنجيا دناڤبەرا باژێر و گوندا سروشتی نەبوويە. جهێ ئاماژە كرنێ يە كۆچبەرێن بەرەف ئێك يا زێدەيە كيشوەرێ ئوستراليا ب پلا ئێكێ ل باژێر خۆ دجهبووينە و خو جهدبن ، چونكی ئاستێ ژيان و ژيارێ د ڤان جهاندا يێ بلندە و هەمی خزمەتگوزاری تێدا هەنە ئەڤەژی بلی وێ كو مروڤ ب ساناهی دشێت كاری بو خو تێدا بينت ، هەر ڤێ وەكريە كو پتريا كوچبەران ل باژێران خو جهبن ،ب تايبەت باژێرێن مەزنێن وەكی ئاماژە بو هاتيە كرن.

ئەڤە و گرنگترين باژێرێن ئوستراليا ئەڤەنە:

١- **سدنی :** مەزنترين باژێرێ ئوستراليا يە ، ژمارا ئاكنجيێن وی ژ چار مليون كەسە پترە . دەربەندەكێ گرنگە.

٢- **ملبۆرن :** باژێرێ ئوستراليا يێ دووێ يە ، ژمارا ئاكنجيين وی نزيكی ۳,٥ مليون كەسە.و دەر بەندەرەكێ گرنگێ ئوستراليايە.

٣- **بريزبن و بيرس و ئۆلايد :** سێ باژێرێن مەزنێن ئوستراليا نە.

٤- **كانبيرا :** هەر چەندە باژێرەكێ بچووكە بەلێ يێ گرنگە ، چونكی پايتەختێ ئێكرتيا ئوستراليايە.

## جوگرافیا ئابووری یا ئوسترالیا

کاودانێ ئوسترالیا ژ لایی چالاکیێن ئابووری ڤە چەند تایبەتمەندی هەنە ، د ڤێرێدا دێ باسێ گرنگترین کەرتێن ئابوورین ئوسترالیا کەین:-

### کەرتێ چاندنێ:

د سەرهندێرا کو ئەو رووبەرێ بگێر چاندنێ دهێت زۆرێ کێمە نا گەهیتە (١٥٪) یێ ژ کیشوەرێ ئوسترالیا ، لێ گەلەك زیرانە، شیاینە وی رووبەری ب جۆرەها دانا و دکاکی بچینن و کەرتێ چاندنێ رولێ خو د بەرەڤ پێش برنا ولاتیدا ببینت هەر د ڤێ بیاڤیدا ئوسترالیا ژلاي چاندنێ ڤە پێگەهەکێ دیار دناڤ ولاتێن جیهانێ دا هەیە ، هەروەسا دهنارتنا درامەتێ چاندنێ بۆ ژ دەرڤە وەك (( کەنم ، کوشت ، و دان و دکاك ، شەکر ، هری ، بەرهەمێن شیری ...هتد)). هەروەسا بەرهەمێ ئاژەلی پلا ئێکی هەیە ب رێژا ( ٦٠٪) ژ بهایێ بەرهەمێ چاندنا ئوسترالیا پێکدئینین و بەرهەمێ رووەکی (٣٧٪) و پەلەوەر (٣٪)

### کەرتێ پیشەسازی:

بها و نرخێ بەرهەمێ پیشەسازی ل پێش بها و نرخێ بەرهەمێ گشتوکالێ دێت ، کەرتێ پیشەسازی زورێ پیشکەفتیە ، ئەڤ پیشکەفتنە ژی ژ ئەنجامێ بکارئینانا سەرمایە یە ل کەرتێ پیشەسازیدا ژ لای سەرمایە دارێن ئوسترالي و بیانی ، ل دەسپێکا سالا ٢٠٠٤ز دا نزیکی (٢١٪) ژ دەشتێ کارکرنێ د پیشەسازێدا بوو .

ئەڤ پێشکەفتنە ڤەدگرێت بۆ چەند هۆکارەکا ژوان:-

١- هەبوونا مادێن دەسپێکێین رووەکی و ئاژەلی وکانزایێت پێدڤی بو پیشەسازیێن جۆرا جۆر ب ئاستەکێ باش گونجای.

٢- هەبونا دەستێ کارێ شارەزا و ژێهاتی زانا.

٣- هەبونا سەرمایەکێ زۆر ( چ سەرمایێ خومالی بیت یان بیانی ).

٤- هەبونا وزا پێدڤی ، ب تایبەتی ژی وزا رەژێ.

٥- جهێ جوگرافي ئوسترالیا ، کو تارا دەیەکی جهەکێ دویرە ، ئەڤ جهە هاریکاربوویە ژ بۆ گەشەکرنا پێکهاتین جودا جودایێن کەرتێ پیشەسازی بو دابینکرا پێدڤیێن جورا و جورێن ئاکنجیێن ئوسترالیا دوور ژ هەڤرکیا بەرهەمێن پیشەسازیێن ولاتێن دیترێن جیهانێ.

٦- سانەهیا هنارتنا بەرهەمێن پیشەسازیێن ئوسترالیا بو ژ دەرڤە بو ولاتێن کومنویلث کو ئوسترالیا ئەندامە د وێ کۆمەلێدا.

## پرسیار

١- بەشێن ئوسترالیا چەندن ؟ بژمێرە.

٢- زەڤین نزمبیێن ( ئوسترالیا ) د بنە چەند بەش ؟ بژمێرە

٣- ئەگەرێن جوداهیا باران بارینێ ل ئوسترالیا ب خال رۆهن بکە .

٤- هندی بەرەڤ ناڤ ئوسترالیا بچین ، رادا بارانا سالانە بەرەف کێمبونێ دچێت . بوچی ؟

٥- (( ئوسترالیا ژ کیشوەرن هشکە )) لسەر ڤێ رستێ باخڤە.

## جهێ جوگرافی نیمچه گزیرتا عەرەبی:

نیمچە گزیرتا عەرەبی دکەڤیتە لایێ باشورێ رۆژ ئاڤایێ کیشوەرێ ئاسیا ،وجوگرافی زانایێن عەرەب د گۆتێ (گزیرتە ،دۆر گە) چونکی ب سێ لایاڤە ب ئاڤا دەریا دۆرماندۆرە : ژ رۆژ هەلاتێ ڤە کەنداڤە و ژ رۆژ ئاڤای دەریا سورە و ژ باشوری دەریا عەرەبی یە و زەریایێ هیندیە ، و ژ لایێ باکوری هەڤ سنۆرە لگەل ولاتێ شام وعیراقێ ، بڤی شیوەی دکەڤیتە دلێ جیهانا کەڤن (کیشوەرێن ئاسیا وئەوروپا وئەفریقیا ) و ژ کەڤن هەتا نهو خەلەکەکا هەڤ گرتنێ بوو دناڤبەرا رۆژ هەلات ورۆژ ئاڤایێدا .

## جهێ مەککە :

بازیرێ مەککەهێ هەرژ بەرێ وەرە جهەکێ تایبەت هەبوو لپەي کو جهێ ئێکەمین مالا خودێ یە کۆ کەعبا پیرۆزە وئیبراهیم پێغەمبەر دروست کریە ، هەرژ وی دەمی جهەکێ پیرۆزە وخەلك ژ هەموو لایاڤە ب مەرەما حەجێ سەرەدانا وێ دکەن .
ژ لایەکێ دی ڤە ئەڤ بازێرە گەلەك یێ گرنگە ژبەر کو دکەڤیتە سەر رێکا بازرگانی،کاروانێن بازرگانی ژ شامێ بۆ یەمەنێ وبەروڤاژی ب مەککەهێدا دچوون . بڤێ چەندێ بۆ بازیرەکێ بازرگانی.
د قورئانا پیرۆزدا ل سورەتا (ئیلاف) ئاماژە پێکریە :

## ژیانا محەمەد (س.خ)

## بەری پێغەمبەراتیێ

## ژیاننانا پێغەمبەری(س.خ).

محەمەد(س.خ) سەرب هۆزا (قورەیش) ڤە وبو کو ناڤدارترین هۆزا عەرەبی بوو ، ودڤێ هۆزێدا ژی سەر ب پاقژترین وناڤدارترین بنەمال بوو ئەو ژی بنە مالا(بەنو هاشم )ی یە.

محەمەد ل وێ سالێ ژ دایك بوو کو ب (سالافیل)هاتبوو نیاسین، چونکی لڤێ سالێ حەبەشیا ب سەرکردایەتیا (ئەبرەهەی) وب بکار ئینانا ژمارەکا زۆر ژ فیلان هیرەشەك ئینا سەر مەککەهێ ب مەرەما داگیرکرنێ وهەرڤەندنا کەعبا پیرۆز ، بەلێ سەر نەکەفتن ونەڤ رویدانە ل قورئانا پیرۆز ژی هاتیە ئاماژە پێکرن وسورەتەکا تەواو ب ناڤێ سورەتا (فیل) بەحسێ ڤێ رویدانێ دکەت .ئانکو محەمەد (س.خ) دڤێ سالێدا ژ دایك بوویە کو دکەڤتە بەرامبەر سالا ٥٧١ ی زاینیی .

محەمەد (س.خ) ب ئێتیمی یێ مەزن بووی، بابێ وی عەبدولا چوو بەر دلوڤانیا خودێ کو هێشتا محەمەد (س.خ) د زکێ دایکا خودا بوو، دەمێ ژیێ وێ گەهشیتە(٦) سالان ئامینا دەیکا وی ژی چوو بەر دلوڤانیا خودێ . ئانکو هەر ژ بچووکی ترش وتەعلاتیا بێ دایك وبابا دیتیە ، ودوور بوو ژ سوز ودلوڤانیا دایك وبابا . ژبەر هندێ باپیرێ وی(عبدالمطلب )ی محەمەد برە دەڤ خۆ وچاڤدێری وپەروەردەکرنا وی ب ستوویێ خۆڤە گرت.

و د ژیێ (٨)سالیدا باپێرێ محەمەدی چوو بەر دلوڤانیا خودێ وپشتی هنگی مامێ وی ئەبو تالیبی برە دەڤ خۆ و خودان کر . قورئانا پیرۆز ئاماژە ب بێ دایك وبابیا پیغەمبەری کریە کو دبێژیت ((الم یجدک یتیما فآوی )):-

بێگومان د بیبین کو ژیانەکا بڤێ شێوەی مرۆڤ زێدەتر هەست ب رامانا مرۆڤایەتیا پاقژ وسۆز ودلوڤانییێ دکەت بەرامبەر بێ بابا ولێکەفتیا.ژبەر هندێ پێغەمبەر (س.خ) هەست ب نەخۆشی وئازارێن تەخا هەژار ولێکەفتیان کر.

محەمەد (س.خ) هەر چار سالێن ئیکێ ژ زارۆکیا خۆ ل دەڤ هوزا (بەنی سعد) کو ئافرەتەکێ ژ ڤێ هوزێ بناڤێ (حەلیما سەعدیە) داینگەهیا وی کرد ل بیابانێ بوراندن . ژبەر هندێ ب هێزی ولەش ساخلەم وزمانەکێ پاقژ وبژین و ژ ێهاتی مەزن بوو، ول ژینگەهەکا بیابانی یاهوسا یاهێمن وپاقژ بەهرە وشیانێن پێغەمبەری(س.خ) گەشتر لێگرن .

## سالۆخەتێن پێغەمبەری (س.خ) :

پێغەمبەری ل دەسپێکا لاوینییێ ب شڤانیا تەرش وکەوال بەرامبەر پارەی بۆ خەلکێ مەککەهێ دکر ،ول فەرموودەکێ دا هاتیە کو پێغەمبەر دبێژیت ((پێغەمبەر نەبوون تەرش وکەوال خودان نەکربیت)) ول ژییێ (٢٥)سالییێدا کارێ بازرگانی بکرێ بۆ ژنەکا بازرگان ل مەککەهێ دبێژنێ (خەدیجە کچا خوەیلد) کریە بڤێ چەندێ چاڤێن وی پتر ڤەبوون وپتر شارەزایی ژیان وئارێشەیێن خەلکی بوو،ئەڤەژی کەلەگا گرنگك بوو،بۆ کەسەکێ کو پەیاما ئەسمانی دستوییێ وی دا بیت وبگەهینتە خەلکی .

**زیریا پێغەمبەری :** پێغەمبەر (س.خ) ب خودان عەقلەکێ دروست وبوچونێن رەسەن هاتبوو نیاسین ،نموونە بۆ ڤێ چەندێ دزۆرن ،وەکی رویدانا دانانا (بەرێ رەش ) ل جهێ خۆ ل کەعبێ ،ئەو بوو جارەکێ ب ئەگەرا باران بارینەکا زۆر ل مەککەهێ دیوارێن کەعبێ هەرفین .

وخەلكێ مەككەهێ بريار دا كو بتمامی ديوارێن كەعبێ ب هەرفينن ودوبارە سـەروشـنوى دروست بكەن ، پشتى كو ئەڤ كارە ئەنجامدا دڤيان (بەرێ رەش) كو پيرۆزيا خۆ هەبوو ل جهێ وى دا داننەڤە بەلێ هەر هۆزەكێ دڤيا شەرەف ومەزنيا ڤى كارى ب دەستێ وى بيت ،لسەر ڤێ چەندێ هەڤركيەكا دژوار كەفتە دناڤبەرا وان دا هەتا گەهشتە رادەكێ كو گەف ل ئێك دو كرن ،ل داويێ بريار هاتە دان كو هەمى لا رازى بن ب ناڤبژيكرنا ئێكەمين كەس كو ل دەرگەهێ (بنەمالاشەيبە) بهێتە ناڤ كەعبێ ، خودێ حەز كر كو ئەڤ كەسە پێغەمبەر بيت ،كو پێغەمبەر ديتى پشتى راست بوون و گوتن ئەڤە (ئەمين) هات وب بريارا وى ئەم درازينە .دەمێ پێغەمبەر ب ڤێ چەندێ ئاگەهدار كرى ،بۆ دەمەكێ هزرێن خۆ كرن وپاشى ساكۆيێ خۆ دانا سەر ئەردى و بەرێ رەش دانا سەر ساكۆيێ خۆ وداخواز ژ وان كر كو هەر ئێك ژوان لايەكێ ساكۆى بكريت وبلند كەن وبدەستى خۆ پێغەمبەرى بەرێ رەش دانا جهێ وى وبڤى شێوەى هەمى لا رازى بوون ب هزرا وى ،ژبەر ئاقلداريا پێغمبەرى ئاگرێ شەرى ژ هوزێن عەرەبا دووير خست كو بەرى نهو ژبەر هوكارێن زۆر بچووك تر شەرێن درێژ دناڤبەرا وان داروى ددان .

**چالاكى**

گروپەك ژ قوتابيان بەلاڤۆكەكا ديوارى لسەر ژيانناما پێغەمبەرى (س،خ) ئامادەبكەن .

**راستگوٚتن ودەستا پاقژیا پێغەمبەری:** پێغەمبەر(س.خ) ل جحێلینیدا ب (راستگوٚتن ودەست پاقژ ) یێ دهاتە نیاسین  دنافبەرا خەلکیدا ب سەرەدەریەکا جوان وبجهئینانا سوٚز وپەیمانا وسەرجەم رەوشتێن بلند ، وئەڤەژی بوٚ ئەگەرا هندێ کو خەدیجە کچا خویلد داخوازێ پێغەمبەری بکەت کارێ بازرگانییێ بوٚ بکەت بوٚ وان کاروانا ئەوێن دهنارتن بوٚ باژیرێ (بوسرا) بەرامبەر کرێیەکا دو قات کو بدەتە کەسەکی دی ژنێزکێن خوٚ ،ول گەشتا ئێکێ پێغەمبەر ل ب مفایەکی زوٚر ڤەگەریا مەککەهێ ، وژبەر دلسوٚزیا و دەست پاقژیا وی خەدیجایێ کریا وی و ژوێ ئەوا سوٚز پێ دای زێدەتر لێکر.و رەوشت وسالوخەتێن پێغەمبەری بوٚنە پالدەر کو خەدیجە داخوازێ ژێ بکەت کو شوو پێ بکەت .

بەری پێغەمبەراتییێ ب چەند سالێن کێم ، خودێ مەزن وەسا حەزکر بوو کو پێغەمبەر حەز ژدەرکەفتنێ بکەت بچیتە شکەفتا (حراء) کو چیایەکە دکەڤیتە لایێ باکورێ روٚژ ئاڤاییێ باژارێ مەککەهێ ول وێرێ هەر سال بوٚ ماوێ هەیڤەکێ کو هەیڤا رەمەزانێ بوو دما کو هزر د نیشانێن مەزناتیا خودێ ژ دروستکرنا ئەرد وئەسمانی وهەمی زیندەوەران دکر . ولسەر ڤی بارودوٚخی بەردوەام بوو هەتا سروٚش (وحي) ژلایێ خودێ ڤە بوٚ هاتی ، ول دەسپێکێ ئایەتەك ژ قورئانا پیروٚز بوٚ هاتە خارێ .



## هاتنا سرووش ( الوحى ) بۆ پێغەمبەری(س.خ):

پێغەمبەر (س.خ) ژیێ وی (٤٠) سال تمام کر وچوو دژیێ چل وئێك سالێدا دەمێ وەحی (سرووش) بۆ هاتیە خوار ئەو ژی ل دەوروبەرێ سالا ٦١٠ زایینی بوو. دەستپیکێ پێغەمبەری(س.خ) خەون دیتن وخەونێن وی راست بوون وئەو خەون وەکی روناهیا رۆژی راست بوون ، پشتی وان خەونان تمامی دل ودەرونێ وی وەکی خودیکەکا (ئاوێنە) روون وپاقژ لێ هات بوو ئێکسەربەرێ دلێ خۆ ئێکەردا خودی ورێگا راست ڤی ، دەمی دا حەز دمانا بتنێ دا دکرد.

هەتا رۆژا دووشەمبی ل (١٧)ی رەمەزانا پیرۆز ریکەفتی ٦/٨/٦١٠ز ئێکسەر جبرائیل سلاڤ لێ بن هاتە خوارێ مزگینیا پێغەمبەریێ دا یێ وگۆت (محەمەد) مزگینی بۆ تە تۆ بوویە پێغەمبەرێ خودێ بۆ سەر خەلکی و ئەز جبرائیلم ، هەر ژبەر ڤێ چەندێ مانا بتنێ ل دەڤ شیرین تربوو ، وبتنێ چۆ شکەفتا (حراء) وپەرستنا خودێ وچەند شەڤا ل وێرێ ما ودگەل خو خارن دبر ب ڤی شێوە ژیا هەتا فریشتەیەك (ملائك) هاتیە خوارێ وگۆتێ بخوینە -وپێغەمبەری (س.خ) گۆتی ئەز نەخواندەڤانم .

پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت ئەز گرتم گڤاشتم پاش ئەز بەردام وگۆتە من بخوینە من گۆتێ ئەز نەخواندەڤانم . بۆ جارا دووێ ئەز گڤاشتم ، وپاشی ئەز بەردامە ڤە وگوتە من : بخوینەمن ژی دیسا گۆتێ ئەزنەخاندەڤانم بۆ جارا سییێ ئەز گرتم وگڤاشتم وگۆتە من:بخوینە ئەڤجا ئەڤ ئایەتا هەنێ بۆ خواند ((أقرأ بأسم ربك الذي خلق * خلق الانسان من علق * اقرأ وربك الاكرم الذي علم بالقلم * علم الانسان مالم يعلم )) وپێغەمبەری سلاڤ لێ بن دووبارە کر.

## بانگەوازیا ئیسلامێ

بانگەوازیا ئیسلامی دژیانا پێغەمبەری دا(س.خ) هەر ژ دەمی بوویە پێغەمبەر هەتا کۆ چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ ب دو قووناغا بۆری یە :–

ئێك / قووناغا ئێکێ : بانگەوازییا نهێنی ، بۆ دەمێ سێ سالان ڤەکێشا

دوو/ قووناغا دوێ : بانگەوازییا ئاشکرا بتنێ ، دانوستاندن ، ئەڤە ژی هەتا کۆ مشەخت بوونا وی بۆ مەدینێ یابەردەوام بوو.

### قوناغا ئێکێ:بانگەوازییا نهێنی:

پێغەمبەر (س.خ) پشتی سرووش ب فەرمانا خودێ بۆ هاتیە خوارێ دەست ب گازیا خەلکی کر بۆ پەرستنا خودێیەکێ بتنێ کو(الله)ە هێلانا بت پەرستیێ وئەڤ کارە ژ بنهێنی بوو ژ ترسا قوریشیێن بت پەرست بەحسێ ڤی بابەتی نە دکر بەلکو بتنێ روییێ بانگوازیێ بەرەڤ وان کەسان بوویێن کۆ پەیوەندیەکا خزمایەتی یەکا نزیك

دگەل هەبوو یان ئەو کەسێن نیاس وجهێ باوەریێ بان. و ئەڤ قوناغەژی پشتی هاتنە خوارێ یا ئایەتا ((يا أيها المدثر ،قم فأنذر...)) دەست پێکری.

ئیکەمێن کەس کو باوەری ب پێغەمبەری ئینای وهاتیە دناڤ ئیسلامێ دا (خەدیجا) یاهەڤژینا وی بوو، ئەڤجا (عەلي کورێ ئەبو تالبي)پسمامێ کۆ ل وی دەمی ژێ وی دەه سال بوون ، وددیڤدا (زەید کورێ حارس ) وپاشی (ئەبو بەکر سەدیق) رازی بوونا خودێ ل سەر بن وئێکەمین کەس ژ کویلان(عبد)کو مسلمان بووی (بیلالێ کورێ رەباحی یێ حەبەش) بوو.

ل ماوێ سێ سالێن بانگەوازیا ب نهێنی نزیکێ (٤٠) کەسان ژ زەلام وژنان باوەری ب پێغەمبەری بانگەوازیا ئینا ،مسلمان دڤی دمیدا بنهێنی دگەهشتە ئیك دوو وگەلەك جارا ل مالا(ئەرقەمێ کورێ ئەرقم) بنهێنیڤە کوم د بوون وتیدا پێغەمبەر (س.خ) ئایەتێن قورئانا پیرۆز بۆ دخواندن وشیرت لێ دکرن ، دویر ژبەر چاڤێن بێ باوەرو بت پەرستان ئەڤ حالەتە ل قووناغا هاتی ژی درێژی هەبوو .

## قووناغا دووێ: ئاشکرا کرنا بانگە وازی یێ ( بانگەوازیا ئاشکرا ):

پشتی بورینا سێ سالان ژ بانگەوازیا نهێنی خودایێ مازن فەرمان دا پێغەمبەری کۆ بانگەوازیا خۆ ئاشکرا بکەت وبەرهنگاریا بێ باوەرو بت پەرستان بکەت ل دیڤ ڤی ئایەتێ((فاصدع بما تؤمر و اعرض عن المشركين، انا كفيناك المستهزئين)) هەر وەسا ئایاتا :((وأنذر عشيرتك الاقربين ، واخفض جناحك لمن اتبعك من المؤمنين، فأن عصوك فقل أني بريء مما تعملون )) ئەڤ دەسپێکا قووناغا

ئەشكەنجەدانا پێغەبەری (س.خ) وهەڤالێن وی بوو، چونكی بت پەرستێن قورەشیان گەلەك د لگران وتورە بوون،دەمێ دیتی كۆ پێغەمبەریێ داخواز دكەت خودێ یەكێ بتنێ ب پەرسێن، كو چاڤێن وان وی خودێ نابینن بەلێ خودێ وان دبینیت وئاگەهداری هەمی كارێن وانە .
پشتی ڤێ چەندێ ئازار وئەشكەنجەدانا بێ باوەران بۆ پێغەمبەری وهەڤالێن وی توندو تیژی پتر لێ هات ،گەلەك رەنگێن ئەشكەنجەدان ژگرتن سفكاتی ولێدان وداخكرن وزنجیر كرن ورراكێشان ل سەر زكی ودانانا بەران ل سەر زك وپشتێن وان دگەرمترین دەمێن رۆژێدا.

## مشەخت بوونا مسلمانان

## مشەخت بوون بۆ حەبەشە :

ژبەر زێدە بوونا بەردەوام یائازارو نەخۆشێن هەڤالێن پێغەمبەری ل سەر دەستێ بێ باوەرێن بازێرێ مەککەهێ، پێغەمبەری ل هەیڤا رەجەبێ ل سالا(٥)ێ پێغەمبەریێ داخواز لێ کر کۆ مشەخت بن بۆ ولاتێ حەبەشە . کو پاشایێ حەبەش مەسیحی بوو زەلامەك بوو کەسێ بچیتە لایێ وی زولم لێ ناهێتە کرن. ول وێرێ بمینن هەتا خودایێ مەزن دەرگەهەکێ بۆ ڤەدکەت ،ئەو بوو دەسپێکێ (١٠) زەلام و(٤) ئافرەت ل رێکا دەریایا سۆر چوونە یەمەن وبرێکا بەلەمێن بازرگانی چوون بۆ حەبەشە ب رێکا دو بەلەمێن بازرگانی داکو چنە یەمەنی ب رێ کەفتن. هەر چەندە قورەیشیا دڤیا بگرن وبزڤرینە ڤە بەلێ بێ ئومێدبوون .

پشتی هنگی ژمارا مشەخت بوویان زێدە بوون تاگەهشتە (٨٣)زەلام و(١٨) ئافرەتان وچەند زارۆکان.

نەجاشی شاهێ حەبەش گەلەك رێز لێ گرت و سۆز پەیمانا پاراستن وڤەحەواندنا وان د اکو ب خۆشی وئارامی ل ولاتی وژیانا خو بورینن. هەر چەندەبێ باوەرێن قوریشیا بزاڤ دکرن کۆ باوەریێ بۆ نەجاشی ب چێکەن ب ریگا هنارتنا شاندەکی کۆ (عەمرو کوری عاص ) سەرپەرشتیا وی شاندەی دکر

بۆ وی چەندێ کۆ مشەخت بوویێن مسلمان نە حەوینیت وڤەگرینتە ڤە مەککەهێ بەلێ بزاڤێن وان سەر نەکرت .

ئەڤ مشەخت بوونا مسلمانان بۆ حەبەشە ، ئەڤە ئێکەمین مشەخت بوو دیرۆکا ئیسلامی دا دهێتە هژمارتن

## دابرینا گشتی:

دەمێ دەنگ وباسێن ڕێزگرتنا نەجاشی ل مسلمانێن مەشەختبوی گەهشتنە قورەیشیان گەلەك پێ نەخوشبونن وبریاردا ڕێکەکا دی ب کار بینن بو ئێشاندنا پێغەمبەری وئەوێن ل گەل وی ،

ئەوژی بریارا برینا هەمی جوّرێن پەیوەندیێن چڤاکی وئابوری ل گەل (بنەمالا هاشمیان ) وبنە مالا عبدول موتەلیب . ل دیڤ ئەڤێ بریارێ کو هاتە نڤیسین و ل ناڤ کەعبێ هاتە هەلاویستن هەتا کو هەمی لایەن پێگیربن ب ڤێ ناڤەروکا وێ،هەمی جورێن سەرەدەریێن کرین وفروّتنێ وبازرگانی وئاخفتن ل گەل وان کرن وتێکەلبوون وژن وژن خوازی ل گەل بنامالا هاشمیا قەدەغەنە ل گەل ئەڤان دوو بنەمالان حەتا کو محەمەد دناڤـ وان بکوژن.

ئەوبوو ئەندامێن ڤان دو بنەمالان زەلام وژن بچیك دویر ئێخستن بونهالێن ئەبو تالیبی دوّر پێچ کرن.

ئەڤێ دوّر پێچیێ ماوێ دوو ئان سێ سالاڤە کێشا ، دڤی ماوەیدا مسلمان وئەو کەسانێن ژ(بنەمالاهاشمیا )

وئەوێن هەڤ سوّز بووین د گەل مسلمانان نەخوشیەکا مەزن دیت ،بەلێ ئەڤە نەبو ئەگەرێ لا وازکرنا بیروباوەرێن وان.

**راهێنان**

بوّچی قورەیشیان بەرهنگاریا موسلمانان دکر...؟

## دەرکەفتنا پێغەمبەری(س.خ) بۆ باژێری تائیف :

پێغەمبەری (س.خ) پشتی دیتی کو ئێدی ئاکنجیێن مەککەهێ باوەریێ پێ نائینن ، هزر کر کو بانگوازیا خۆ ڤەگوهێزێت بو ژدەرڤەی مەککەهێ ئەوبو ب هەڤالینا (زەیدێ کورێ حاریسە)ی بەرەڤ باژارێرێ تائیفێ چون هیڤیا وان ئەوبوو هۆزا (سەقیف) دێ باوەریێ پێ ئینیت کو مەزنترین هۆزا ئاکنجیا ڤێ باژێری یە . بۆ ماوێ (١٠) رۆژا مانە تێدا ، ئو داخازا ئیسلام بوونێ سەرکەفتنێ ژێ کر بەلێ وان گوهێ خۆ نەداییێ وکارێن خراب دژی وان کرن وگۆتێ ب زیترین دەم باژێری ب جهبێلن د اکو کەسێن لاو نوی پیگەهشتی نەکەڤنە بن کارتێکرنا بانگەوازیێ ڤە . ئەوبو راهێلا ب دویڤ پێغەمبەری ڤە و ژلاییێ کێم عاقل وزاروکان ڤە هاتە بەر باران کرن کو بویە ئەگەرێ سەرشکادنا زەیدەی بریندارببوونا پیی پێغەمبەری (س.خ) ب شێوەی ئەڤ بزاڤانا پێغەمبەری بۆ بلاڤ کرنا ئاییینێ ئیسلامێ ژ دەرڤەی مەککەهی سەرنەگرت .

## بانگەوازی کرنا هۆزێن عەرەبی بو ئیسلام بوونێ :

ئەڤێ جارێ پێغەمبەری (س.خ) باش زانی بانگەوازیا خو ب شاندێ هوزێن عەربی ژ دەرڤەی مەککەهێ رابگەهینیت کو ب مەرەما حەجکرنا سالانە د وەرزێ حەجێدا سەرەدانا مەککەهێ دکر ئو داخاز ژێکرن کو ئاینێ باب وباپێرن خو بهێلن کو بت پەرستی بوو خودێ بتنێ بت و چ هەڤالا بو چێنەکەن ،هەر وەسا داخازا پشتەڤانیکرنێ سەرێخستنێ ل سەر قورەیشیێن بت پرستان کر کو هەر دەم پێغەمبەر وهەڤالێن وی دئێشاندن هەر چەندە هەلویستێ شاندێ هوزێن عەرەبی

جودا جودا بوو هندەك ژوان پشتەڤانیا خۆ بۆ بانگەوازیێ دەربری و هندەك ژوان دژی بانگەوازیێ بوون . ئەوێن باوەری پێ ئینای ئاكنجیێن باژێرێ (مەدینە )یێ بوون.

ل وی دەمێ كو پێغەمبەر ل (عەقبە) چاڤ ب كومەكا كەسانێن سەر ب هۆزا ئەوس و خەزرەج ئاكنجیێن (مەدینێ ) كەفت داخـــــازا مسلمان بوونێ ژێكر ئەوژی مسلمان بوون . كو هژمارا وان حەفت كەس بوون . پشتی ڤەگریانا وان بۆ باژێرێ مەدینێ دەنگ وباسێن پێغەمبەری و پەیاما وی بۆ كەس وكارێن نزیكی خۆ بەحس كو .

## پەیمان ( گفتیا ) ئێكێ یا عەقبە :-

ل سالا داهاتی ئانكو : سالا دوازدێ ژ پێغەمبەرایەتیێ - دوەرزێ حەجێدا دوازدە كەس ژ خەلكێ مەدینێ ، نەهـ ژوان سەرب هۆزا ئەوس وسێ ژوان سەرب هۆزا خەزرەج ڤەبوون ، بۆ حەجێ هاتبوون مەككەهێ چاڤ ب پێغەمبەری (س.خ) كەفت ل گەل كومبوون وسۆز وپەیمان وپشتەڤانی دانە پێغەمبەری كو هاتە نیاسین ب پەیمانا (گفت) یائێكێ یاعەقبە پێغەمبەری ژی ئێك ژ هەڤالێن خۆ كو ناڤێ وی (موصعەبێ كورێ عومەیری) بوو ل گەل وان هنارتە مەدینێ بۆ هندێ كو وان فێری خواندنا قورئانێ بكەت وئەوان د ئیسلامێدا شارەزا بكەت .

ئەو بوو هێشتا سال نەزڤریە ڤە چ مال ل مەدینێ نەما بوون كو بەحسێ ئیسلامێ تێدا نەهێتە كرن.

## (گفتا ) دویێ یا عەقەبە :-

ل سالا دا هتي هەر ل وەرزێ حەجێ ،چەند كەسەك ژ خەلكێ مەدینێ كو ژنوی مسلمان ببوون هاتنە مەككەهێ هژمارا وان (٧٣) زەلام و(٢)ژن بوون هەمی ژ هەردو هۆزێن ئەوس وخەزرەج بوون.

پێغەمبەر(س.خ) هەر ل (عەقەبە )ل گەل وان كومبوو چەند ئایاتێن قورئانا پیرۆز بۆ وان خواندن و پالدان ل سەر باوەر پێ ئینانەكا ب هێز ب ئیسلامێ ئەوان ژی بانگەوازیا وان قەبوول كر وسۆز دا یێ كو بەرەڤانیێ ژێبكەن ،هەر وەسا پیشنیازكر كو سەرەدانا بازێرێ وان و ب خۆشحالیڤە پێشـوازیێ لێ كەن .

ئەڤ پەیمانەژی ب گڤتا عەقەبەا دویێ هاتە نیاسین كو رێ خۆشكرنەكبوو بۆ مشەخەت بوونا مسلمانان بو بازێرێ مەدینێ . بێگومان ئەو دەست پێشخەریا نوینەرێن ئەوس وخەزرەج دیاركری ومسلمان بوونا خو بو پێغەمبەری (س.خ) راگەهاندی وخۆشحالیا خۆ دەربەری بۆ مشەخت بوونا پێغەمبەری(س.خ) ل مەدینێ .

## مشەخەت بوون بۆ یەثرب ( مەدینێ ) :-

دەمێ قورەیشیان ب ڤێ زانی كو هندەك كەسان ژ ئاكنجیێن مەدینێ پەیمانا دای پشتەڤانیا پێغەمبەری بكەن وباوەری ب بانگەوازیا وی ئینایە ،زۆر نەرەحەت بوون مسلمان پتر ئیشاندن. ژبەر هندێ پێغەمبەری (س.خ) فەرمان دا هەڤالێن خۆ، رێكا مەدینێ بگرن وبۆ ڤی بازێری مشەخت بن و تێگەهاندن كو ل ڤی بازێري (خودێ مەزن چەندبرایەك بۆ هەوە یێن پەیدا كری وجە ژی یێ بۆ هەوە پەیدا كری كو دێ تێدا ئارام بن ودێ هێنە حەواندن .

ل سەر ئەڤێ فەرمانێ مسلمانان ب کەت وکوم پشتی خو ئامادەکرین، نهێنی دویر ل بەر چاڤێن قورەیشیا ،پێنگاڤ هاڤێتن بەرەڤ مشەخت بوونێ

مسلمان کوم کومە مشەخت بوون حەتا وە لێهات مسلمانەك ل مەککەهێ نەما ژبلی پێغەمبەری و(س.خ) ئەبو بەکرێ صەدیق وعەلی کورێ ئەبو تالبی.




## هەولدانا قورەیشیان ژبۆ ژناڤبرنا پێغەمبەری (س.خ):

پشتی قورەیشیێن مەککەهێ پشت راست بووین ژباشی وژیانا مسلمانان یا خوش ل مەدینێ ، مەزنێن وان کومبوونەك گرێدا ل (دارولنەدوە – خانیێ کۆرِ گرێدانان) بۆ دەست نیشان کرنا رێکەکا گونجای بۆ ژناڤبرنا بنەمالا پێغەمبەری، ئەوبوو بریار دا کو هەر هۆزەك لاوەکێ ب جەرگ و چاڤ نەترس حازر بکەت وهەمی پێکڤە بچنە پێغەمبەری د شەڤەکا تاریدا بکوژن وخوینا وی ژی دناڤ هۆزادندا بەرزەببیت .

دا كو بنەمالا پێغەمبەری نەشێن شەرێ هەمی هۆزا بكەن ونەچار بن ب (خوین دانێ) رازی بن:
هەمی لاوێن دەست نیشان كری بۆ كوشتنا پێغەمبەری خۆ بەرهەفكر ل وێ شەڤا پێغەمبەری بریار دای كو مشەخت بیت ، ل بەر دەرگەهێ مالا وی راوەستان وچاڤەرێی دەركەفتنا وی دكر دا كو بكوژن .
ئەوێ شەڤێ پێغەمبەر ل سەر جهێ خۆ نەنڤست بوو بەلكی داخاز ژ (عەلی كورێ ئەبوتالبێ ) پسمامێ خۆ كربوو كو ل جهێ وی بنڤیت .
پێغەمبەر (س.خ) ژ مال دەركەفت بێی كوئەو لاوێن خۆ بۆ كوشتنا وی ڤەشارتی ببینن ، وبەرف مالا (ئەبو بەكری) رێكەفت كو بەری هنگی دو هەسب حازركربوون بۆ خۆ وپێغەمبەری (س.خ) ئەوبو ب دوقولی ژ مال دەركەفتن و ب شارەزایەك كو (ئەبو بەكری) بكرێ گرتبوو بۆ هندێ دارێكا مەدینێ نیشا بدەت جودا ژوێ رێكا كو قورەیشیان دزانی دا كو ئەو بێ باوەر رێكا وان نەزانن.
پێغەمبەر و(ئەبوبەكرێ) هەڤالێ وی ل سپیدەهیا رۆژا پێنج شەمبی رۆژا ئێكێ ژ هەیڤا رەبیعا ئێكێ ژ مەككەهێ دەركەفتن.
دوی دەمیدا ژیێ پێغەمبەری(٥٣) پێنجی وسێ سال بوون .

## گرنگترین كارێن پێغەمبەری ل مەدینێ:

هەر دگەل گەهشتنا پێغەمبەری(س.خ) بۆ مەدینێ،بزاڤا هندێ دكر كو دڤێ قووناغا نوی یا بانگەوازیێ دا ب وی كارێ دكەڤیتە سەر ملێ وی رابیت كو ئارمانجا وی رێكخستنا مسلمانان و بنیات دانانا دەولەتا ئیسلامێ بوو كو ل سەر بنیاتەكێ موكم دامزرانت ئو هەمی مەرج وپێدڤیێن ئەڤێ ئارمانجێ دابین بكەت .

## گرنگترین ئەو بناغێن کو دەولەت ل سەر دامزراندی، دڤان کارێن سەردکی دادهێتە دیتن کو ئەڤەنە

### ئێک/دروستکرنا مزگەفتان :

پێغەمبەر درێکا مشەختبوونێ دا بۆ مەدینێ ، دەمێ کو ژڤی باژێری نزیك بووی گەهشتە گوندێ (قوباء) کو دو فەرسەخا مەدینێ دویرە، ل وێرێ دگەل (ئەبوبەکری) خۆدا لایەکی وچوار روژا تێدا مان ، ل دەسپێکێ مزگەفتەك دروست کر کو ب مزگەفتا (قوباء) دهێتە نیاسین .




پشتی ڤی گوندی درێژی ب سەفەرا خودا هەتا کو گەهشتیە مەدینێ ، کارێ ئێکێ ژی کو ل وێرێ ئەنجامدای دروستکرنا مزگەفتێ بوو کو ب هاریکاریا موسلمانێن مشەختبووی وموسلمانێن پشتەڤان (کو خەلکێ مەدینێ بوون ) دروست کر، هەژی گۆتنێ یە کو پێغەمبەری ب خۆ پشکداری دکارێ دروستکرنا ڤێ مزگەفتێ دا کر. گەلەك پێڤە نەچو ئەو مزگەفتا ل دەسپێکێ ب شێوەکێ سادە وساناهی دروستکری بوو مەلبەندەکێ روحی ژبەر ئەنجامدانا نڤێژو هەر پەرستنەکا دی.

هەر وەسا بو فەرمانگەهەکا رامیاری ولەشکری و دسنیشان کرنا پەیوەندیێن دەولەتێ ل نافخوّو ژ دەرڤە و بوّ گریّدانا کوّر وسمینارا وکومبوون وگەنگەشە ودان وستاندنان دەربارەێ بابەتێن گرنگ.

## دوو/ دروستکرنا برایەتێ دناڤبەرا مشەختبووان وپشتەڤانان :

پێنگاڤا دووێ یا پێغەمبەری (س.خ) ل مەدینێ چارەسەرکرنا ئەو فەیرانا دارایی و ژیارێ بوو کو ژ ئەنجامێ ب جە هێلانا ماڵ وحالێن خوّ نك مشەخت بوویێن مەککەهێ ، ب مەرەما رێکخستنا پەیوەندیێن کومەلایەتی وتاکو دلێ وان نەمینن کو بتنێ ئەو بێ مالن پێغەمبەری فەرمان دا کو هەر مشختبوویەك وپشتەڤانەك ببنە برایێن ئێك ژ پێخەمەت خودێ . بڤێ چەندێ ئێکەتیا موسلمانا دێ موکمتر و رێزێن وان دێ دپەیت تربن .

## سێ / پەیرەو دەستوور و(پەڵگەنامە ):

گرنگترین پێنگاڤە د مێژوویا ئیسلامێ دا،ل مەدینێ پێنگاڤا سیێ یا پێغەمبەری (س.خ) دارشتنا بەڵگەنامەیەکێ بوو بوّ ریکخستنا پەیوەندیان دناڤبەرا ئەندامێن جڤاکێ موسلمانا ژلایێ مشەختبووا وپشتەڤانان ڤە ، ژلایەکێ دی ڤە دناڤبەرا موسلمانان وئەو جڤاکێن دی کو ل مەدینێ خوّ جهبووین ب تایبەت ژی جوّهی وڤێ بەڵگەنامێ چەند خالێن زوّر گرنگ تێدابوون ، کودشیێن ب کورتێ هندەك ژ بەندێن وێ بێخینە بەر چاڤ :

١-ئێكبوونا نەتەوا موسلمانان بێ جوداهی.

٢- پارستنا هەر كەسەك وتەخەیەكێ كو بڤێت بتەناهی ب هاریكاري دگەل موسلمانان بژین ، وقەدەغەكرنا هەر جۆرە ستەمەكێ ژ دەر حەق وان .

٣-پێدڤی یە موسلمان ونەموسولمان هاریكاری ئێك بن وپشتا ئێك و دوو بگرن بۆ دویرئیخستنا هەر مەترسیەكا ل سەر دەولەتێ ،هەر وەسا هەر دوولا پێدڤی یە پشكداریێ دخەرجیا شەرا دا دابكەن ئەگەر روویدا .

٤- موسلمان ونە موسولمان، نابیت دوژمنێن دەولەتێ ب پارێزن وهاریكاریا وان بكەن.

٥- پێدڤی یە دەولەت ، هەر نە موسلمانەكی سەربێخت ئەگەر كەفتە بەر زولم و زورداریێ ودەست درێژی ل سەر هاتە كرن وەكی چەوا موسولمانا سەردئێخت ودپارێزیت .

٦- چ كەس ب تاوانا كەسەكێ دی ناهێتە گونەهباركرن .

**راهێنان**

پێنگاڤا سەرەكی یا پێغەمبەری (س.خ) دارشتنا دەستووری بوو دەستوور چیە ؟ (دان وستاندن دڤی باریدا بیهێنە كرن

## هەلویستێ جۆهیان :

جۆهیێن مەدینێ و دەوروبەران گەلەك پێ نەخۆش بوون ژ هاتنا پێغەمبەری بۆ ڤێ بازێری وئێكبوونا رێزین موسلمانان وئاشتبوونا هەر دوو هۆزان(ئەوس وخەزرەج) ل سەر دەستێ پێغەمبەری (س.خ) كو بەری ئیسلامێ گەلەك هەڤرك و نەیار بوون ، جوهی ژ سەروماڵێ خو نەدترسیان پشتی كو ئەوێ سوز وپەیمان داینێ ل دیڤ باوەرناما مەدینێ كوپێغەمبەری (س.خ) دەرئێخست بوو ، بەلێ ترسا وان ئەوبوو كو ئیسلام ل ناڤ وان بەلاڤەببت وپلە وپایێن وان بهێنە خوارێ.
ژبەر ڤێ چەندێ چەند رێكەك ب كار ئینان ژبو بەرهنگاریكرنا پێغەمبەری وپەیاما وی وەك پروپاگندە درەوپێڤەنان وپیلان گێڕان وئاژاوە (فتنە) دناڤبەرا ئەوس وخەزرەج دا وهەولدان بۆ ساغكرنا دوژمنایەتیا بەری موسلمانبونا وان.

## بەرگری كرن ژئیسلامێ :

خودایێ مەزن رێك دا پێغەمبەری وموسولمانان كو شەری بكەن ، ل دویڤ ئایەتا پیرۆز ((أذن للذين يقاتلون بأنهم ظلموا وأن الله على نصرهم لقدير ٭ الذين أخرجوا من ديارهم بغيرحق ٭ ألا أن يقولوا ربنا الله))
ئەڤ رێك پیدانە ژی ژبەرهندێ بوو كو زولم ل موسلمانان هاتیە كرن ل سەر ولات وماڵ وحاڵێ وان دەرئێخستبوون ب نەحەقی ، هەر ژبەرئەوێ بوو كو بتنێ ئەوان خودایێ خۆ ب پەروەردە كارێ خۆ دزانی.

## چەند نەموونەیەك ژ شەرێن سەردەمێ پێغەمبەری (س.خ) :

پشتی ئاكنجیبونا پێغەمبەری (س.خ) ل مەدینێ ودامزراندنا بناغێ دەولەتێ ، زنجیرەیەكا شەر وپێگداداناندناڤبەرا موسلمانان ژلایەكی و قوریشیا وهەڤپەیمانێن ژ هۆزێن عەرەبی ژلایەكێ دی ڤەهاتنە رویدان ژوانان ژی :

### ١- شەرێ بەدرێ مەزن (٢ك) :

ئەو شەر بوو كو ل رۆژا ١٧ێ هەیڤا رەمەزانێ دسالا دووێ كۆچی هاتیە رویدان. ئەگەرێ وێ ئەو بوو كو پێغەمبەری(س.خ) هاڤالێن خۆ پالدان بۆ رێگرتنا كاروانەكی بازرگانیێ قورەیشیان لدەمێ ژ شامێ ڤەدگەریان بۆ مەككەهێ . نەب مەرەما شەری بەلكی ژبەر ئەوێ بوو چونكی قورەیشیان موسلمان ژ مەككەهێ دەربەدەر كر بوون ودست ب سەر هەمي ماڵ وخانیێن وان دا گرتبوو كو بجه هێلابوون . مەبەست پێ ئەو بوو كو موسلمان بهێنە قەرە بوو كرن ل شوینا ماڵێ وان یێ چوویی ودەست ب سەر كاروانێ بازرگانی دا بگرن كو ئەڤ كاروانە سەر ب ئەبو سوفیانی ڤە بوو .

هەر چەندە ئەو كاروان دەربازبو و ودەستێ مسلمانان نە گەهشتێ كو ژ مشەختبووان بوون ، بەلێ ئەو لەشكرێ بەری هینگێ ئەبوسوفیانی داخاز كری كو ژ مەككەهێ ب هەوارا وان بچن ، هەر رژدبوو ل سەر درێژەپیدانێ وپێشڤە ڤەچوونێ دناڤبەرا هەر دوو لا ل جهەكی دگوتنێ (بەدر) ئەنجامێ ڤی شەری ب سەركەفتنا موسلمانا ب دوماهیك هات .

بڤێ سەرکەفتنا مەزن موسلمانان شیانێن وان بلندتر لێهاتن و باوەریا وان ب خوٚ زیدەتر لێهات هەر چەندە وان دزانی ئەڤ سەرکەفتنە ژدەڤ خودای بوو ، چونکی سەرەرای ئەوێ نەهەڤسەنگیا دناڤبەراهەردو هێزا هەی لێ ب سەرکەفتن چونکی بیرو باوەریەکا موکم هەبوو وان دزانی یێن لسەر راستییێ شەري دکەن وبەرەڤانی ژخوٚ دکەن .

**٢- شەرێ ئوحد(٣ک):**

ئەڤ شەرە ل روٚژا شەمبی ١٥ ی هەیڤا شەوالێ ل سالا سییێ کوٚچی هاتە رویدان ، ئەگەرێ وی ژی ئەو بوو کو قورەیشیان دڤیا تولا شکەستنا بەدر ڤەکەن ، ژبەر کو ئێکسەر پشتی بەدرێ ، هەمی کەڤتنە خوٚ ئامادەکرنێ وهێز و کەرەستە کومکرن بوٚ رویب ریبوونا پێغەمبەری وهەڤالێن وی .

ئەوبوو (٣٠٠٠) سێ هێزارکەس ب وپشتەڤانیا هژمارەك ژ هەڤپەیمانا برێ کەفتن کو حەفت سەد ژوان زری پوش ودوسەد سوارێن هەسپان.وهەڤدەئافرەت دگەلدا بوون کو ئێك ژوان هندا کچا عوتبەی هەڤژینا ئەبو سوفیانی بوو کو بابێ وێ ل شەرێ بەدرێ هاتبوو کوشتن وبوٚ تولوڤەکرنێ هاتبوو.

هەر چەندە ژمارا موسلمانان هزار کەس بوون بەلێ ب رێکێ ڤە (٣٠٠) کەسی ژێڤەبوون کو ژ کەسێن دو روی بوون ب سەکردایەتیا (عەبدولا کورێ ئەبی سەلول ) بڤێ چەندی ٧٠٠ کەس مان .

هێزا موسلمانان بەرف مەیدانا ئوحدێ برێ کەفتن ، پشتا وان ل چیایی ئوحد بوو وسینگێ وان ل دوژمنی بوو .

شەری دسپێکر وموسلمان سەرکەفتن ، ژ بتپەرستان ژی ژمارەك ژێ هاتنە کوشتن وئەوێن دی ژی پاشڤە چون ، دەمێ (کەتیبا) کڤان هاڤێژێن موسلمانان کو ژلایی جیایێ ئوحدێ سەنگەرگرتبوو، ئەڤ دیمەنە دیتین هوسا زانی کو شەر ب دووماهی هات وپێدڤی ناکەت ل جهێن خۆ بمینن ، ژبەر هندێ پتریا وان هاتنە خارێ بۆ ناڤ میدانا شەری ژبو کومکرنا ئەوی کەلوپەلێ وتڤاقێ دوژمنان ل دویف خۆ هێلای.

دەمێ کوهێزەکا بتپەرستا دیتی کو هێزا موسلمانان لای چیایێ ئوحودێ بجە هیلایە ، ل پشت وانرا زڤرین وهێرەشەکا دەملدەست کرنە سەر وشیان هەرزوی ئەنجامێن شەری دبەرژەوەندیا خۆ دا ئێك لان وحەفتێ کەسان ژ موسلمانان بکوژن کو دناڤ واندا حەمزەیێ کورێ عەبدولموتەلیبی بوو مامێ پێغەمبەری .

ئەڤجا ئەگەرێن سەرەکی یێ ڤێ شکەستنا موسلمانان د شەرێ ئوحودێ دا ڤەدگەریتەڤە بۆ نەپێگرییا وان ب فەرمان وشیرەتێن پێغەمبەری(س.خ) ڤیانا وان بۆ مالی ودەستکەفتێن شەری (الغنائم)



## رێکەفتنا حودەیبییە (٦ك) :

ل سالا شەشێ مشەختی پێغەمبەری(س.خ) دڤیا سەرەدانا مەککەهێ بکەت بۆ بجهئینانا (عومرێ) ( ئەڤەژی : سەرەدانا کەعبا پیرۆز ولدۆر زڤرین نە ل وەرزێ حەجێ ) ئەڤەژی ب هەڤالینیا (١٤٠٠) کەسان ژ هەڤالێن وی ل هەیڤا (ذو القعدة) کو ئێکە ژوان هە یڤێن شەرکرن تێدا قەدەغەیە وپیرۆزیا خۆ یاهەی بریکەفتی ، بو وێ چەندێ کو خەلکێ مەککەهێ تێبگەهن کو ئەوبۆ شەری نەهاتینە . بەلێ قورەیشی ئامادەنەبوون کو رێکێ بدەنێ دا (عومرا ) خۆ بکەن ، وپشتی دان وستاندنێ دناڤبەرا شاندێ قورەیشیان ب نوینەریا (سوهەیلی کورێ عەمر ) وپێغەمبەری(س.خ) گەهشتنە ریککەفتنەکێ کو ب(رێکەفتنا حودەیبییە یاناڤدارە) کو جهەکە سێ میلا بۆلایێ باکوري ژ مەککەهێ دویرە.

ناڤەرۆکا وێ ژڤان خالان بوو:

١-راوەستانا شەری دناڤبەرا هەردو لا بۆ ماوێ دەه سالا.

٢-دڤێت محەمەد هەر کەسەکی ڤەگرنیت ژ قورەیشیان کو بێ ئاگەهداریا سەر پەرشتکارێ خۆ موسلمان بووی.

٣-هەر موسلمانەك ئەگەر رێزێن ئیسلامەتیێ بجهبێلیت. قورەیش یا پابەندنینە ب وی ڤەگرنە ڤە بۆ لایێ محەمەدی.

٤- هەر کەس ولایەنەکی ماف هەیە کو ببیتە هەڤپەیمانێ قورەیشیان یان ژی ببیتە هەڤپەیمانێ محەمەدی.

٥-محەمەد وهەڤالێن وی پێدڤیە ئەڤ سالە ڤەگرنە ڤە و(عومرێ ) نەکەن بە لکو ل سالا بهێت دا بۆ وان ماف هەیە کو بیهێنە ناڤ مەککەهێ وماوێ سێ رۆژا تێدا بمینن. وژبلی شیرێ دناڤا کاڤلانکێدا چ تشتێ دی ڤێ نەبن .

## پەیوەندی کرنا پێغەمبەری(س.خ ) ب پاشا و دەست هەلاتدارێن سەردەمێ خۆ:

ژبەر کو ئایینێ ئیسلامێ پەیامەکـــا تایبەت نینە ب عەربان ڤە بەلکو لدویف چەندین ئایەتێن قورئانا پیرۆز بۆ هەمی خەلکی یە بێ جوداهیا رەنگ ونفش وئەزمانان :((وما أرسلناك الاّ كافة للناس بشيرا و نذيرا))(قل يأيها الناس انى رسول الله اليكم جميعا )).بڤی رەنگی پێغەمبەری چەندین نامە ب دەست نڤێسینا نڤیسەرێن خۆ هنارتن بو پاشا ومیر ودەست هەلاتدارێن وی سەر دەمی وەکو(هەرقەل)قەیسەرێ رۆمێ و(ئەبروێز) کیسرایێ فارس و(نەجاشي) پاشایێ حەبەشە و(مقەوقەس)مەزنێ قوبتیان (مەسیحیێن ) مسرێ ومیرێ بەحرەین ومیرێن عومان وپاشایێ یەمەن . کو ناڤە رۆکا تێکرایی یا وان نامان داخوازکرن بو وژ ڤان دەست هەلاتداران کو بهێنە ناڤ ئایینێ ئیسلامێ.

## فەتحا ( ڤەکرنا )مەککەهێ ( ٨ك ):

هەر وەك بەری نوکە بەحسکری رێکەڤتنا حودیبییە دەلیڤەدا هەردو لایان : قورەیشی ومحەممەد ل دروست کرنا هەڤپەیمانەکێ ل گەل هەر هوزەکا عەرەب. ئەوبوو (بەنوبەکر) بوونە هەڤپەیمانێن قورەیشیان و(خوزاعة) بۆ نەهەڤپەیمانێن پێغەمبەری. ودڤێ سالێدا (٨ك) ، هۆزا بەکر دەست درێژی کرە سەر خوزاعە ونزیکی بیست کەسان ژێ کوشتن ، وقورەیشیان هاریکارێن چەکی ودارایی دانە هۆزا بەکر . ل دەمێ کو ئەڤ دەنگ وباسە گەهشتینە پێغەمبەری زۆر تورەبو وخۆ ئامادەکر بۆ شەرێ قوریشیان بەلێ ئەڤ کارە ب نهێنی ڤە بوو بۆ ئەو کەسێن کو دێ ب رێکەڤن .

نەكو قورەيش خۆ ئامادەبكەن وخوين برژيت وكوشتن روبدەت ل باژێرێ مەككەها پیرۆز .

پێغەمبەر ب هەڤالینیا دەهـ هزار كەسان ژمەدینێ دەركەڤتن بەرڤ مەككەهێ چوون ودرێكێدا هژمارەك ژ هۆزێن عەربان گەهشتنێ ، دەمێ كو نزيك بوين ژ باژێرێ مەككەهێ قورەيشی زۆر ترسیان ژ تولڤەكرنێ بەلێ پێغەمبەری ئاكنجیێن باژێری پشت راستكرن كو ئەو د ئازادن ودێ لێ بۆريت سەرەرای وان هەمی تاوانێن كو دەرهەق پێغەمبەری وموسلمانان ئەنجامداین هەرژ ئازاردان وگرتن ودەربەدەر كرنێ ودا برینێ .

## حەجا خاتر خاستنێ ( ١٠ ك ):

حەجا خاتر خاستنێ ئێكەم حەج بوو كو پێغەمبەری دژیانا پێغەمبەرایەتیێدا ب ئەنجام دای ،ئەوژی ل سالا دەهێ مشەختێ بوو .

دەمێ موسلمانان گوهلێ بووی كو پێغەمبەری ئنیەتە دوێ سالێدا حەجێ بكەت ، ژ هەمی لایێن گزیرتا عەرەبی بەرەڤ مەككەهێ چوون دا كو پشكداریێ دگەل بكەن ، كو ژمارا وان ژسەد هزاران زێدەتربوو .ئەوا كو گرنگ دڤێریدا ئەوگۆتار بوویا كو پێغەمبەری بۆ ئامەدەبوویان خواندی كو دوماهیك وەسیەت وشیرەت بوون جونكو هێشتا سال تمام نەبووی چو بەر دلۆڤانیا خودێ .

ئەوا كو پتر دا كوتی ل سەركری پێكهاتبوو ژ هاندانا موسلمانان ل سەر پێگری ب شەریعەتا ئیسلامێ ونەزڤرین بۆ سەردەمێ نە فامیی وحەلال نەكرنا خوینا ئێك ودو ونەخارنا مالێ ئێك ودو ب هیچ شێوەكی، هەر وەسا داخاز ژێكرن كو مافێ ئافرەتان بپارێزێن وب باشترین شێوە رەفتارێ دگەل بكەن . وبیرا موسلمانان ئینا كو ئەو هەمی هاریكاریا ئێك دوو بكەن وپێدڤیە ل دویڤ ب قورئانا پیرۆز ورەوشتێ پێغەمبەری بچن.

**پرسیار :**

١– نیمچە گزیرتا عەرەبی دکەڤیتە کیش ژ بەشێ ئاسیا ؟

٢– بۆچی زۆر جاران بەری ئیسلامێ کێشە وشەر د ناڤبەرا هوزێن عەرەبان دا رویددا ؟

٣– پێغەمبەری ل دەسپێکا لاوانیا خۆ چ جۆرێ کاری دکر ؟

٤– بانگەوازیا ئیسلامێ ب چەند قوناغان دا دەرباز بوویە ؟

٥– بۆچی حەبەشە هاتە هەلبژارتن بۆ مشەخت بوونا موسلمانان بەرەڤ وی وەلاتی؟

٦– گرنگترین پێنگاڤێن ، پێغەمبەری(س.خ)ل مەدینێ چ بوون .

## بەندێ دوێ

## دەولەتا ئیسلامێ ل سەردەمی خەلیفێن راشدیندا

## (١١ك-٤١ك/٦٣٢-٦٦١ز)

پشتی وەغرکرنا پێغەمبەری (س.خ) (١١ك/٦٣٢ز) سیستەمەکی فرمانداریا نوی ل دەولەتا ئیسلامی پەیدا بوو، ئەو ژی سیستەمێ خەلافەتێ بوو ، بۆ سەرۆکاتیێ ژ ئەگرێ هاتنا چار خەلیفان ئیك ل دویڤ ئێك ل دەولەتا ئیسلامی دا ل سەر ریبازا پێغەمبەری (س.خ) کۆ فەرمانرەوایی کر وەکی (ئەبو بەکرێ سەدیق) و(وعمەرێ کورێ خەتاب )و( وعوسمانێ کورێ عففانی) و (وعەلی کورێ ئەبی تالب) خودێ ژوان رازي بیت ، ب هەول وشیانێن وان خەلیفان سنۆرێ دەولەتا ئیسلامی بەرفرەهی ب خۆ ڤەدیت ، پەیاما پیرۆزا ئیسلامی ژ دەرڤەی نیمچەی گزیرتا عەرەبی بلاڤ کر .

### ئەبو بەکر سەدیق (خودێ ژێ رازی بیت)

(ئەبو بەکر عەبدوللا کوری ئەبی قوحافە عوسمان کورێ عامر تمیمی) ب دو سالان پشتی (سالافیل) ل مەککەهێ ژ دایك بوویە .

ئەبو بەکر سەدیق هەڤالینی دگەل پێغەمبەری(س.خ) هەبوو ، بەری کۆ سرۆش (وحي) ژ لاي خودیڤە بگەهیتێ ، وی دەمی پەیاما پیرۆزا ئیسلامێ گەهشتیە پێغەمبەری(س.خ) ئەبو بەکر ئێکەمین کەس بوو کو باوەری پێ ئینای ومسلمان بووی.

ئەبو بەکر بەری مسلمان ب بیت کارێ بازرگانی دکر.

## وەرگرتنا خەلفەییێ

دەمێ پێغەمبەری ل سالا ١١ك/٦٣٢ز وەغەرکری،دەولەتا ئیسلامی پیدڤی ب کەسەکی بوو کۆ جهی وی بگریت وکاروبارێن دەولەتا ئیسلامی ل سەر رێبازا وی ب ریڤەببەت ، وێ پەیاما بیروز ب گەهینتە بەرباban، ئەو بو موسلمان ل مەدینێ ب پشتەڤان ومشەخەت بوویاڤە گفتی د اکو ئەبو بەکرێ سەدیق دەست نیشان کەن بۆ خەلیفێ پێغەمبەری (س.خ)وب دگوتنە ڤێ گفتێ ژی (گفتیا تایبەت) چونکە یاتایبەت بوو ب چەند هەڤالێن پێغەمبەری ڤە(س.خ) کۆ ل (سەقیفەی بەنی ساعدە) ودیار کرنا ئەبو بەکر بۆ خەلافەتێ ل دەمێ وەغرنا پیغەمبەری بوو(س.خ).

## گۆتارا ئەبو بەکرێ سەدیق
## ( خودێ ژی رازی بێت )

پشتی کو مسلمانان ئەبوبەکرب خەلیفێ پێغەمبەری (س.خ) دانای بۆ ب ریڤەبرنا کاروبارێن دەولەتا ئیسلامی، ئەبو بەکری ژی گۆتارەکا گرنك بۆ وان گۆت (گەلی خەلکی ئەز ب فرمانا هەوە هاتیمە دانان وئەز هەوە هەمیا پاشتر نینم ، ئەگەر ئەزێ باش بم هاریکاریا من بکەن ، وئەگەر خرابم من راست بکەن ،راستی پاقژیە ودرووەوژی نە پاقژی یە، ل نك من یێ ب هێزە بێ هێزێ هەوە و ئەو مافی ژێ هاتیە وەرگرتن دێ بۆ وێ ڤەگەرینم ئەگەر خودی حەز بکەت ، ئەڤێ بهێز لای من یێ بێ هێزە هەتا ئەو مافێ وی بری مافی وی ژێ وەربگرم ئەگەر خودێ حەز بکەت ، هەر نەتەوەك شەری درێگا خودێدا بهێلیت (جهاد) خودێ دێ وان سەرشۆر کەت ، گوهداریا من بکەن دا ئەزژی گوهداریا خودێ پێغەمبەری بکەم ، وئەگەر دژی بیرو راێن خودێ وپێغەمبەری بم ئێکسەر دژی فەرمانێن من بن .

## دەولەتا ئیسلامێ ل سەر دەمێ خەلیفە
## ئەبو بەکرێ سەدیق ( خودێ ژێ رازی بیت )

پێغەمبەر (س.خ) د دەولەتا ئیسلامی دا هەول ددا کۆ نفش پەرستی وعەشیرەتی ل دناڤبەرا موسلمانان نەهێلیت ، گەلەك جارا قورئان خوین بۆ وان عەشیرەت وهۆزان دهنارت ئەوین باوەری پێ ئینایین ، بەلێ بنە مایێن ئاینێ ئیسلامێ تنێ نەگەهشتبوون، زەلامێن خۆ هنارتن بۆ کومکرنا زکاتێ ل دیف بنە مایێن ئاینێ ئیسلامێ ، پەیوەندی دناڤبەرا پێغەمبەری(س.خ) ووان هوزا پەیوەندیەك بوو کۆ ل سەر ئاستی کەسایەتیا بوو نەکە ل سەر ئاستێ ئاینی بوو وی دەمی کوپێغەبەری وەغرەکری(س.خ) ، وان هۆزان هوسا دزانی کو ئاینێ داوی هات ، ئەڤجا کۆ بەشیکی زورا وان هوزا ل نیمچەی گزیرتا عەرەب ل ئاینێ ئیسلامی لێڤەبوون ب دمیژوویا ئیسلامیدا ناڤێ وان ب بزاڤا لێڤەبوویان هاتیە .

هەندەك کەسان ژ زەلام وئافرەتان خۆ دیار کر وبانگەوازیا پێغەمبەرایەتیێ ، ئەوێن لێڤەبووین پالدان بۆ دژایەتی کرنا ئاینێ ئیسلامێ ژوان ژی (موسەیلەمەی کەذاب و ئەسوەد عەنسی وعەلقەمە ی کوڕی سلاقە وطلیحة بنت خویلد الاسدي .......وگەلەکێن دی ).

خەلیفە ئەبو بەکرێ سەدیق (خودێ ژێ رازی بیت) پشتی داوستاندن دگەل موسلمانان وسەر کردێن لەشکری بریار دا کۆ ب دژواری بەرسینگێ وان بگرت ،سەرکردایەتیا لەشکری دا دەستێ خالد کوڕی وەلیدی سەرکەڤیت ودەولەتا ئیسلامی ژ مەترسیا وان بپارێزیت .

## هۆکارێن بزاڤا لێڤەبوویان

بزاڤێن لێڤەبوویان ل سەر دەمێ خەلیفە ئەبو بەکر سەدیق (خودێ ژێ رازیبیت) پەیدابوون بەلێ ئەڤ رویدانە ب ژنشکەکێڤە(مفاجیٔ) نە بوو بەلکی ئەنجامێ کومەکا هوکاران هاتیە،وەکو:

١- عەرەبێن نیمچە گزیرتی شانازی ب هۆزایەتییێ دکر ، دەمی کو ئاینێ ئیسلامێ بەلاڤ بووی هەڤرکی ودەمارگیری(عەصەبیەت) دگەل وەغەرکرنا پێغەمبەری(س.خ) جارەکا دی نەهێلا.

ئەو عەرەب لێڤەبوون وزڤرینە ڤە بۆ رەوشت و تیتالێن خۆ یێن کەڤن و وەسا هزرکرن کو ئایینێ ئیسلامێ ب دویماهی هات .

٢- هندەك هۆز هەبون پشتەڤانێن پێغەمبەری (س.خ) بوون ل سەر ئاستێ پەیوەندیێن مرۆڤاینی وسیاسی ، بەلێ دەمێ کو پێغەمبەری (س.خ) وەغەرکری ئەو پەیوەندی وپشتەڤانی بۆ ئیسلامێ نەمان .

٣- زکات دان هوکارەکێ گرنگ بوو بۆ لێڤەبوویان ب تایبەتی ل دەڤ هۆزێن یەمەنێ ویەمامێ ، هۆزا (بەنی تمیم ) ئامادەبوونا خۆ راگەهاند کودێ هەر موسلمان مینن ب مەرجەکێ کو زکاتێ نەدەن.

## ژناڤبرنا بزاڤێن لێڤەبوویان

خەلیفە ئەبو بەکر سەدیق (خودێ ژێ رازیبیت) هەر ژ دەستپێکا سەر هلدانا بزاڤێن لێڤەبوویان وەسا هزرکر کو ئەڤ بزاڤەمەترسییە بۆ سەر دەولەتا ئیسلامێ ، ئەڤجا هەولدا ب دو رێکا بۆ ژناڤبرنا بزاڤێن لێڤەبوویان

١/ل دەست پێکێ ب کارێ دبلۆماسی دەست پێکر ، وەکی هنارتنا هندەك ژ شاندێن خۆ بۆ دەڤەرێن جود جودا ل نمچە گزیرتا عەرەبی، داخاز ژ لێڤەبوویان کر کو بزڤرن ڤە بۆ ناڤ جڤاکێ ئیسلامی و ل بن ئالا يێ ئیسلامێ .

٢/ ئەڤ رێکەژی پێکهاتبو ژ ئامادەکرنا لە شکری و ودیار کرنا سەر کردێن وان، ئەڤ هێزە ژ (١١) لەشکرا پێکاهاتبو، ئو هەرسەرکردەکی لەشکری دەڤەرەك ژ نیمچە گزیرتا عەرەبی هبۆ دانابوو بۆ ڤەگراندنا وان بۆ بن ئالایێ ئیسلامێ .

پشتی چەند شەرەکێن ل دویف ئێك ، خەلیفێ ئیسلامێ شیا سەرکفتنێ ب دەست خوڤە بینیت ، و فەگەراندنا پتریا ئەو دەڤەرێن ل ژێر دەست هەلاتا لێڤەبوویان د دەمێ شەریدا بو بن دەستێ ئیسلامێ زڤراندنە ڤە

ئەبو بەکر ل سالا ١٣ ی مشەختی(وەغەر کر).

## عومەرێ كورێ خەتـابـابی ( خودێ ژێ رازی بیت )

## ( ١٣ك-٢٣ ك / ٦٣٤-٦٤٤ ز )

ناڤێ وی عومەرێ كورێ خەتابی كورێ نوفەله ،ب عودەیێ كورێ كەعبی دگەهیتە پێغەمبەری (س.خ) بنەمالا عودەی هۆزەك بور ژ قورەیشیا وبابێ عومەری كەساتیەكا دیار وبەرچاڤ د ناڤ قورەیشیا دا هەبو .

عومەرێ كورێ خەتابی بەری ئیسلام بووناوی خاندن ونڤیسین ب دروستی دزانی ، گەنجاتیا خو ب شڤانی ل دەڤ بابێ خو بۆراندیە ، د ژیێ ٢٦ بیست وشەش سالییێدا موسلمان ببوو، پێغەمبەری(س.خ) ناس ناڤێ (الفاروق) دانایە سەر ، ژبلی ناسناڤێ (ئەبو حەفس) . د ماوێ خیلافەتا عومەرێ كورێ خەتابی دا (خودێ ژێ رازی بیت) فتوحاتێن ئیسلامێ دەسپێكریە ، پرانیا جهێن دەور بەرێن حیجازێ رزگار كرینەوسنۆرێن دەولەتا ئیسلامی ل سەر كیستێ دەولەتا بێزنتینیا وساسانیا بەرفرەهبووینە.

## گرنگترین كارێن لسەر دەمێ خەلیفە عومەرێ كورێ خەتـابی

رێكخستنو وەراركرنا دامو دەزگەهێن دەولەتێ ، هەر چەندە لسەر دەمێ خەلیفێ ئێكێ ئەبو بەكری بزاڤێن ب بەرفرەهكرنا دەولەتا ئیسلامێ دەسپێكریە ، بەلێ د سەر دەمێ خەلیفە ، عومەرێ كورێ خەتابیدا گەهشتە گۆپییتكا بەر فرەهبوونێ ، بەری بەرفرەهبوونادەولەتا ئیسلامێ شام وعیراق وكوردستان وئیران ومسر ژی ب خو ڤەگرت ، ژبەر بەرفرەهبوونا دەولەتا ئیسلامێ وەسا دخاست كو سیستەمەك هەبیت بۆ رێكخستن وەراركرنا دام ودەزگەهێن دەولەتێ ، ژبەر گەهشتنا شارستانیا ئیسلامێ ب شارستانیا نەتەوەێن دیتر برێكیا وێ

سیاسەتێ ، ئەڤێ ژی وەکر کو موسلمان لسەر ئاخا نەتەوێن دیتر خوجهبن وئەو ژی تێکەلی شارستنانیائیسلامێ ببن ، چ ژبەر موسلمان بوونێ یان ژبەر دانا باجێ.

### ١-رێکخستنا بارێ ژیارا سەربازا وجهێن رزگار کری:

سەربازێن دەولەتا ئیسلامێ پێ خەمەت بلندکرنا ئالیێ ئیسلامێ وبەلاڤکرنا ئاینێ پیرۆزێ ئیسلامێ خەبات دکر لسەر دەولەتێ بوو کو رەوشا ژیارا وان رێك بێخیت وپێدڤیێن وان دابین بکەت.

### ٢-رێکخستنا دیوانا وموچێن سەربازا:

لگەل بەرفەرهبوونا سنۆرێن دەولەتا ئیسلامێ ، ژبەر سیاسەتا فرە خوازیێ، سەروەت ،و سامانەکێ زۆر د دەولەتا ئیسلامیدا کۆمبوو ، ب تایبەتی ل عیراقێ، کو خزینا ساسانیا کەفتە دەستێ موسلمانا ، بگرە ژ زێر و زیڤ وچەکێن بها گرانێن ئافرەتا وقوماش وجل وبەرگێن نایاب و ئەوی سەروەت وسامانی پێویستێ ب هندێ هەبوو رێك بهێتە رێك ئێخستن، ب سیستەمەکێ عادیلانە دادپەروەرانە بسەر سەر بازادا بهێتە بەلاڤ کرن . چونکە سەر بازا چ کارێن دی نەبوون ، بۆ دابینکرنا ژیارا خۆ ، ژبەر هندێ رێڤەبەریا دارایی ودیوانا سەربازا هاتە دانان.

خەلیفە عومەر ئێککەمین کەس بوو ، کو ناڤێ سەربازا د دیوانا سەربازیدا تۆمارکری ومووچەوهاریکاري بۆ ڤەبری .

### ٣- سیستەمێ دارایی :-

ئەڤ سیستەمە خەلیفە عومەرێ کورێ خەتابی ( خودێ ژێ رازی بیت ) دامەزراند ، سیستەمەکێ دادپەروەرانە ودروست وگونجای بوو، لەوی پێویستیا نەتەوێن کو تێدا دژیان ، ژێدەرێ داد پەروەریا وی قورئان وفەرموودێن پێغەمبەری (س.خ) بوون .

لگەل زێدەبوونا سەروەت و سامانێ دەولەتا ئیسلامی ، وی بارودۆخی وەسا دخواست کو سیستەمەك بهێتە دامەزراندن ژبورێکخستنا داهات وخەرجیا ، خەلیفە عومەری سیستەمەك ئینا بناڤێ (بیت المال) بۆ پاراستنا مال وموڵکێ ورێکخستنا داهاتی وخەرجێن دەولەتا ئیسلامی.

**راهێنان**

(بیت المال) مال وموڵکێ دەولەتا ئیسلامی تێدا دهاتە دپاراستن.

لڤی سەر دەمی کیشك دەزگەهـ جهێ (بیت المال) دگرت؟

گرنگترین داهاتێن (بیت المال) پێکهاتبوون :-

(الخراج ، الجزية ، الزكاة) جزیە(باجا سەری) ، خەراج (باجا زەڤیێ) .

### ٤- رێکخستنا کارگێری:-

پشتی بەرفرەهبوونا دەولەتا ئیسلامی ، بتایبەتی لسەر دەمێ خەلیفە عومەرێ کورێ خەتابی (خودێ ژێ رازی بیت) ، دەولەتا ئیسلامی دابەشببوو بۆ چەند یەکێن برێڤەبرنێ، ئەو ژی بو ساناهی کرنا رێڤەبەرنا کاروبارێت دەولەتێ بوویە وەکی چاڤدێریا داهاتی ئێکلاکرنا ئاریشێن جڤاکی.

خەليفە عومەرێ كورێ خەتابى لسەر هەر ويلايەتەكێ فەرمانبەرەك دانا ،بو بريڤەبرنا كاروبارێن ويلايەتێ،كو دەسهلاتا خەليفەى وەرگرتبوو و،دگوتنێ (والى)،هەر سێ دەسهلاتێن ياسايى وجێ بريڤەبرن وقەزايى د دەستى دا بوون ، بۆ بجهئينانا كارێن خو پشت ب شيرەت كاران گرێددا .




**٥- سالناما كۆچى:**

بەرى دەركەفتنا سالناما كۆچى ، خو جهێن نيمچەگزيرتا عەرەبى روودان وكارساتێن خو بكار دئينان بۆ دياركرنا مێژوويێ ، نموونە سالا فيل وشەرێ فجار دو رووداێن مێژووى يێن گرنگ بووينە ل نيمچە گزيرتا عەرەبى، بەلێ پشتى خەليفە عومەر (خودى ژێ رازى بيت) بوويە خەليفێ پێغەمبەرى (س.خ) هزر كر كو دڤێت سالنامەكا تايبەت ب موسلمانان ڤە هەبێت ، بۆ ڤێ مەرەمێ ئێكەمين روژا مشەختبوونا پێغەمبەرى(س.خ) لگەل هەڤالێن وى ژ مەككەهێ بۆ مەدينێ ب سالائێكێ يا كۆچى دانا (١ك/٦٢٢ز) وهەيڤا محەرەمێ ب ئێكەمين هەيڤا سالا كۆچى هاتە دانان ، وژبەر وێ چەندێ ژى ئەو مشختبوون ب سالا ئێكێ دانا ، چونكى سالەكا گرنگ بوو دمێژوويا ئيسلاميدا، ولگەل وێ مشەختبوونێ دەولەتا ئيسلامى ل مەدينێ هاتە دامەزراندن.

### ٦- داد وەری:

لسەر دەمێ خەلیفە ئەبو بەکرێ سەدیق (١١ك/١٣ك) ، عومەرێ کورێ خەتابی ب داد وەر (قازی) هاتبوو نیاسین ئەو ژی ژبەر کەسایەتیا داد پەروەرا خەلیفە عومەری بوو، کو ئاریشە ئێکلا کرن، دەمێ وعومەرێ کورێ خەتابی وەك خەلیفە هاتیە هەلبژارتن وژبەر شەرێن فرەخوازیێ دەولەتا ئیسلامی بەرفرەه بوو،موسلمان ب نەتەوەیێن دیتر گەهشتن ، گەلەك جارا ئاریشە دناڤبەرا موسلمانا ونەتەوێن دیتر چێدبوون ، ئەڤجا پێویست بوو ئەڤ ئاریشە ب داد پەروەرانە بیهێنە چارەسەرکرن .

**چالاکی**

((دادوەر نوینەرێ یاسایێ یە))

گرنگترین سالوخەتێن دادوەری(قازی) چنە....؟

## عوسمانێ کورێ عەفانی( خودێ ژێ رازی بیت ).

(٢٣-٣٥ك/٦٤٤_ ٦٥٦ز)

عوسمانێ کورێ عەفانێ ئەبیلعاص، ل مەککەهێ ، پێنجسالا پشتی سالا(فیل) ژدایك بوویە، ب سێ بابا دگەهیتە پێغەمبەری(س.خ)، ژ موسلمانێن بەراهیێ بو ، وی ب زانیارێن ئایینی وشەرمینیێ ودل پاقژیێ وخێر خوازیێ یێ ناڤدار بوو، وئێك بۆ ژوان(١٠)دەه کەسێن کو مزگینیا بەهەشتێ یێ هاتیە دان.پێغەمبەری(س.خ) کچا خو رەقیا لێ مارکر ، و دەمێ رەقیا مری، پێغەمبەری (س.خ) کچا خو ئوم کەلسوم لێ مارکر ژبەر هندێ ب ناز ناڤێ (ذو النورين) هاتە ناڤکرن.

## دیار دێن گرنگێن سەر دەمێ خەلیفە عوسمانێ کورێ عەفانی (خودێ ژێ رازی بیت).

لسەر دمێ خەلیفە عوسمانێ کورێ عەفانی، سێ دیاردێن گرنگ دەرکەفتن ، یا ئێکێ شەرێن رزگارکرنێ بوون، یا دورێ پەیوندی ب کۆمکرنا قورئانا پیرۆز ڤە هەبوو، یا سیێ ژی شەهید بوونا خەلیفە عوسمانێ کورێ عەفانی وسەرهلدانا هەڤرکیێ بوو دناڤبەرا لەشکەرێ موسلمانادا.

### ١/فتوحاتێن ئیسلامی:

ل سالا (٢٥ك/٦٤٥ز) لەشکرەك ژ سەر بازێن شام وعیراقێ ئامادەکر ب فەرماندەیا (حبيب بن مسلمه الفهري ) بۆ دژایەتیکرنا رۆمێن بیزەنتی ل باکورێ کوردستانێ وئەرمەنستان وگەهشتنە (عموریە) ل ئاسیا بچووك . ل سالا (٢٧ك/٦٤٧ز) خەلیفە عوسمانی رێ دا ...

(عەبدولایێ کورێ ئەبی سەرح ) کو ئەفریقیا رزگار کەت ، ئەوژی شیا بەرەف ولاتێ مەغریب بچیت وتەرابلس رزگار کەت هەتا گەهشتیە سبیطلة (باکورێ بازارێ قەیرەوان ) ، هەر ل سەر دەمێ ڤی خەلیفەی ئێکەمین کەشتیگەل (اسطول) ێ ئیسلامی هاتە دروست کرن کو شیا کەشتیگەلێ رۆمێن بیزەنتی ل د دەریا یاناڤەراست بشکێنین وچەند گزیرتێن وەکی قوبرس وروودس رزگار کەن .

## ٢-کومکرنا قورئانا پیروز :

کومکرنا قورئانێ ژ کارێن گرنگێن سەر دەمێ عوسمانێ کورێ عەفانی (خودێ ژێ رازی بیت ) بوون، وکۆمکرن ژی ب ئێك جار نەهاتە کرن ، بەلکی هەموو خەلیفێن راشدی لدویف شیانێن خو پشکداری د کومکرنا قورئانێدا کریە ، لسەر دەمێ خەلیفە ئەبو بەکرێ سەدیق دەسپێهاتەکرن ، وپشتی وەغەرکرنا خەلیفە ئەبوبەکری یا هاتیە کرن ب خەلیفە عومەرێ کورێ خەتابی هاتە سپاردن.
وخەلیفە عومەرێ کورێ خەتابی (خودێ ژێ رازی بیت ) ل شینا ئەبو بەکرێ سەدیق چوو بۆ کۆمکرنا قورئانێ ، ئەڤە ژلایەکی ڤە وژلایەکێ دی ڤە چالاکیێن خەلکی زیدەبوون بو خواندنا قورئانێ وژبەرکرنێ ودیرکەفتن ژ شیان ، ژبەر هندێ خەلیفە عومەری بزاڤ کر کو قورئانێ جارەکا دی کۆمبکەت ، وپشتی شەهیدبوونا خەلیفە عومەری ، ئەو قورئانا هاتیە نڤێسین ل لایێ (حەفسە) کچا خەلیفە عومەری هاتە پاراستن .
وقۆناغا داویێ یا کۆمکرن ونڤیسینا قورئانێ ل سەر دەمێ خەلیفەعوسمان کورێ عەفانی دەسپێکر ، ئەو ژی لیژنەکا چار کەسی پێکئینا کو زمان پاقژ وشارەزایێن زمانێ عەرەبی بوون، زێدە باری ئەڤێ چەندێ کو کەسێن جهێ باوەریا خەلیفە

بوون ، بو بجهێنانا ئەڤی کارێ پیرۆز ، ئەو ژی (زیدێ کورێ پابتی و(سعید کورێ عاصی) و (عەبدوللا کورێ زبیری) و (عبدولرەحمانێ کورێ حارثی ) ی بوون، ومێژوونڤیس درژدن کو ڤێ لیژنێ چار دانە ژ قورئانێ نڤیسینە ، بو بازێرێن سەرەکی و وەلاتێن دەولەتا ئیسلامێ هنارتیە وەکی مەککەهێ وشامێ وبەسرە و کوفە.

## ٣/ شەهیدکرنا خەلیفە عوسمانێ کورێ عەفانی( خودێ ژێ رازی بیت )؛

لسەر دەمێ خەلیفە عوسمانێ کورێ عەفانی(خودێ ژێ رازبیت ، هندەك ژ لەشکەرێ ئیسلامێ پشتە رێ بوون وبوونە ئەگەرا شەهیدکرنا خەلیفەی، ئەو ژی ب کارەسەتەکا مەزن ومێژوویا ئیسلامێدا دهێتە هژمارتن کو دبێژنێ (الفتنة الکبری)(فتنا مەزن ) .

## خەلیفە عەلییێ کورێ ئەبی طالبی

(٣٥-٤٠/٦٥٦-٦٦٠ز)

عەلی کورێ ئەبی طالب (خودێ ژێ رازی بیت) کورێ عوبدولمەنافێ کورێ عبدولموتەلبە پسمامێ پێغەمبەری (س.خ) وئێك بوویە ژ هەڤالێن وی یێن نزیك ، ل باژێرێ مەککەهێ ي ژدایك بوویە ، ئێکەم کەس بوویە د ژیێ سنێلەییێدا موسلمان بووی ، و ل دەسپێکا موسلمان بوونا خو ل مالا پێغەمبەری(س.خ) مەزن بوویە ، ژبەر کو رەوشا ئابوری وژیارا ئەبی طالب یاباش نەبوو .

دەمێ پێغەمبەری(س.خ) زانی کو عەرەبێن بێ باوەر بزاڤا کوشتنا وی دکەن ، هەولدا کو باژێرێ مەککەهێ بجهبهێلیت وبەرەڤ باژێرێ مەدینێ بجیت ، بۆ ڤێ مەبەستێ ژی (عەلی کورێ ئەبی طالب ) ی ل هێلا دناڤ جهێن خودا دا کو بزانن پێغەمبەر(س.خ) یێ ل مالا خۆ. د هەمی شەرێن پێغەمبەری (س.خ) بەشداری کرە بتنێ ل شەرێ تەبوك نەبیت ،د پتریا شەرا ژی دا هەلگەرێ ئالایی موسلمانا بوویە .

پێغەمبەری (س.خ) فاتیما کچا خو ل عەلی کورێ ئەبی طالبی مار کریە .

### روودانێن سەر دەمێ خەلیفە عەلی کورێ ئەبی طالبی ( خودێ ژێ رازی بیت ):

دەمێ خەلیفە عەلی کورێ ئەبی طالبی دەسهەلات ژ دەولەتا ئیسلامی وەرگرتی، دەولەت تووشی کێشە وگرفتێن ناڤخو ببوو ژ ئەگەرێ شەهیدکرنا خەلیفە عوسمانێ کورێ عەفانی (خودێ ژێ رازی بیت) ژلایەکی ڤە وژلایەکێ دی ڤە والیا سەرووەت و ساما نەکێ زۆر کۆ مکر بوو ژئەگەرێ دەست بسەراگرتنا ئەردێ چاندنێ ولایەتێ ئابینی هەتا رادەیەکی پشت گوە ڤەهاڤێتبوو .

لدەسپێكێ عەلی كورێ ئەبی طالبی (خودێ ژێ رازی بیت) دەست هاڤێتەلادانا ئەو والیێن كو ل سەر دەمێ خەلیفە عوسمانێ كورێ عەفانی(خودێ ژێ رازی بیت) هاتبوونە دانان ، چونكی خەلكێ ولایەتا گازندە ژ دەسەلاتا وان والیا هەبوون ، و هەولدا هندەك والیێن لایەنگرێن خو دانیتە جهێ وان كو دگەل سیاسەتا دروستا خەلیفە عەلی كورێ ئەبی تالیبی بگونجن ، پناڤدارترین والیێ كو خەلیفە عەلی كورێ ئەبی تالیبی ڤیای لادەت معاویەیێ كورێ ئەبی سفیانی بوول شامێ چونكی معاویەی وهۆزا ئەموی دڤیا شەهیدكرنا خەلیفە عوسمانێ كورێ عەفانی (خودێ ژێ رازی بیت) بكەنە دوریشمێ سیاسەتا خو داپێ بگەهنە دەسەلاتێ.




قوتابیێ عەزیز هەر سێ خانێن دڤالا بناڤێن گونجای پركە.

## دەركەفتنا گرۆپێ خەوارجا ( الخوارج ):

خەوارج پێكهاتبوون ژ كۆمەكا سەربازێن لەشكەرێ خەلیفە عەلی كورێ ئەبی تالیبی كو ل شەرێ (صفین) ژ لەشكەرێ عەلی جودا ببوون ، ئەوشەرێ دناڤبەرا لەشكەرێ خەلیفە عەلی ومعاویەی دارووداً بوو، و خەوارجا سەركردەك بۆ خو هەلبژارد بناڤێ (عەبدوللا بن وهب الراسي) وناسنایێ خەلیفە یان (امير المؤمنين) پێدا ،

خەلیفە عەلی ب توندی دژایەتیا وان کر ، وبزاڤ وچالاکیێن خەوارجا ئەمن وئاسایشا دەولەتا ئیسلامی ل سەردەمێ خەلیفە عەلی تێکدا ، ود ئەنجامدا خەلیفە عەلی کورێ ئەبی تالیبی ب دەستێ خەوارجا هاتە شەهید کرن.

## (بەردەوامبوونا فتوحاتا )

پشتی دامەزراندنا دەولەتا ئیسلامی ل مەدینێ ، پەیاما پیروزا ئیسلامی ل هەمی نیمچە گزریتا عەرەبی بەلاڤ بوو ، ویەکەکا ئایینی ورامیاری ل دەولەتا ئیسلامی دروست بوو ، ل سەر دەمێ خەلیفە ئەبو بەکرێ سەدیق (١١ك-١٣ك)وەسا دهاتە خواستن کو را سپاردێن پێغەمبەری (س.خ) بجهبینیت، ئەو راسپاردە ژی پێکها تبوو ژ دوورخستنا بیانیا ژ دەولەتا ئیسلامی وبلندکرنا ئالایێ ئیسلامێ وگەهاندنا پەیاما پیرۆزا ئیسلامێ ب هەمی وەلاتا .

ل دەسپێکێ خەلیفە ئەبو بەکرێ سەدیق هوسا ب باش زانی کو ژ بەر چەند ئەگەرا لەشکەرێ رومێن بیزەنتینی ژ وەلاتێ شام دویر بێخیت ، وەکی نزیکبوونا وی ژ دەولەتا ئیسلامێ ئەڤە ژلایەکی ڤە و ژلایەکێ دی ڤە رۆمێن بیزەنتینی دەست هەبوو د هاندانا خەلکي دا کو ژ ئیسلامێ لێڤەبن ودژایەتیکرنا وێ ، وئەگەرەکا دیژی ئەوبوو کو رۆمێن بیزەنتینی دەسەلات هەبوو لسەر وان رێکێن بازرگانی یێن بەرەف وەلاتێ عیراقێ ومسرێ ڤەدچوون.

خەلیفە ئەبو بەکرێ سەدیق خەلکێ نیمچە گزیرتا عرەبی پالدا ، بۆ پشتەڤانیکرنا موسلمانا بۆ رزگارکرنا وەلاتێ شامێ ژدەستێن رۆمێن بیزەنتی ، بۆ ڤێ مەبەستێ ژی چار لەشکەر ئامادەکرن .

## شەری یەرموك (١٢ك-٦٣٤ز)

کو (هەرقل)ێ سەر کردێ رۆما زانی موسلمانا مەرەما لەشکەرکێشانێ یا هەی بۆ شامێ، لەشکەرێ خو کومکر ژ روما وعەرەبێن شامێ وەکی ئاکنجیێن دەولەتا غەساسنە وخەلکێ جەزیرەێ وئەرمینیا ، ژێدەر ژمارا وی لەشکەری ب (٢٠٠) هزار سەربازا دخەملینن.

لەشکەرێ موسلمانا وروما ل نهالا یەرموك جهێن خو گرتن وهەردو لا دەست ب کۆمکرنا چەکی ولایەنگرا کر بۆ بهێزکرنا لەشکەرێ خو ، شەرەکێ گراندناڤبەرا هەردولا دا روودا موسلمان ب خوراگری بسەرکەفت وروم دوی شەریدا شکەستن.

## فەتحا قودسێ (١٦ك/٦٣٦ز).

پشتی دەست بسەرداگرتنا دیمەشقێ ژلایی موسلماناڤە ، ل سەر داخازا خەلیفە عومەرێ کورێ خەتابی (خودێ ژێ رازی بیت) بریاردا کو دەست ب سەر بازێرێ (قودسێ ) ژی دا بگرن وژدەستێ بێ باوەرا بیننە دەر ، ل دەسپێکێ فەرماندێ وی لەشکەری(ئەبو عوبەیدەجەراح) لایەنێ دبلۆماسی بکارئینا ، نامە بۆ خەلکێ قودسێ هنارتن وتێدا داخاز ژێکرکو باوەریێ ب خودێ وپێغەمبەری(س.خ) بینن یان باجێ ل شوینا موسلمان بوونێ بدەن یان شەری بکەن.

دەمێ لەشکەرێ موسلمانا ب فەرماندەیا (ئەبو عوبەیدە لجراح) گەهشتیە نزیك قودسێ ناما دوێ بو ئاکەنجیێن قودسێ هنارت دوبارە داخازیێن بەرێ ژێکرن ، بەلێ ڤێ جارێ ژی چ بەرسڤ نەبوو ، ژبەر هندێ بازێر دۆرپێچکر ، هەتا ئاکنجیێن قودسێ ناچار بووین پەیوەندیێ ب فەرماندێ موسلمانا بکەن.

داخازا وی جۆرێ ئاشتیێ کر یا دگەل ئاکنجیێن دیمەشقێ هاتیەکرن ب مەرجەکی ئەو ئاشتبوون ژی لسەر دەستێ خەلیفە عەمەرێ کورێ خەتابی دابت ، ژبەر کو گول دادپەروەری پەیمانێن خەلیفە عومەرێ کورێ خەتاب بهیستبوون.

| راهێنان |
| --- |
| قۆتابییێ خوشتڤی : نهۆ قودس ل بن دەستێ کێ یە ؟ |
| (سەلاح الدین ئەیوبی) سەرکردێ بناڤو دەنگێ ب نڤش کورد پشتی |
| شەرێ.......قودس ژ بن دەستێ خاچ پەرستا رزگار کر . |
| ڤالاهیا سەری ب پەیڤەکا گونجای پربکە |

## هاتنا لەشکەرێ موسلمانا بۆ عیراقێ

پشتی و موسلمانا دەست ب سەر پتریا ئاخا ولاتێ خۆ دا گرتی و ژ دەستێ رومێن بیزنتی دەرئێخستی ، هزرد ژ عیراقێدا کر دا کو ژدەستێ ساسانیا دەربێخن، چونکی عیراق هەڤسنۆ ربوو دگەل ولاتێ شامێ ومەترسی بۆ دەولەتا ئیسلامی هەبوو .

خەلیفە عومەرێکورێ خەتابی (خودێ ژێ رازی ببت) (ئەبو عوبیدە کورێ مسعود الثقفي) سەرکردێ لەشکەری کو ب دەست بسەر عیراقێدا بگریت و ژ بن دەستێ ساسانیا دەربێخت ، بریێڤە سەرکردە(موثەننا کورێ حارثة الشیباني) ب لەشکەرێ خوڤە پەیوەندی ب وی لەشکەری ڤە کر ، ژ رووبارێ فورات دەرباز بوون وگەهشتنە لەشکەرێ ساسانیا دئەنجامدا سەر کردێ مسلمانا (ابو عبیدەکورێ الثقفي) هاتە شەهید کرن .

سەر كردە (موثنى كورێ حارثة) پلانەكا نوو دانا ئەو ژى ئەو بوو كو ژلايەكى داخازا لەشكەرەكێ زێدەتر ژ مەدينێ كربوو ، وژلايەكێ دى ڤە ساسانى ب فێلبازا راگرتن ودەمێ لەشكەرێ زێدەتر بۆ هاتى شيان لەشكەرێ ساسانيا ل جهەكى دگوتنێ (البويب) بشكێنن وسەر كردێ وان ب ناڤێ (مهران) ژناڤچوو، ولەشكەرێ ساسانيا ڤەگەريا بازيرێ مەدائن.

## شەرێ قادسيە (١٥ك/٦٣٦ز)

سەركردە (سەعد كورێ ئەبى وەقاس) ب چار هزار سەربازاڤە بەرەڤ عيراقێ بريێ كەفت ، لەشكەرێ موثەننا كورێ حارثە كو ل عيراقێ بوو پەيوندى پێڤەكر ، بەرى دەسپێكرناشەر بهێتە گرن دانوستاندن دناڤبەرا هەردو لا دا دەسپێكر ، وداخاز ژ ساسانيا كر كو د ئازادن بۆ دياركرنا چارەنڤيسێ خو بۆ موسلمان بوونێ يان دانا باجێ .

بەلێ فارس رازى نەبوون ، ودئەنجامێ شەرەكێ وگراندا كو سێ رۆژا ڤەكێشا ، تێدا موسلمان ب سەر كردايەتيا (سعد) سەركفتن وپشتى هينگێ دەستێ خو دانا سەر مەدائن گرت (پايتەختێ دەولەتا ساساني كو دكەڤيتە ژێريا بەغدايا ئەڤرۆ)

## كوردستان ل هەمبەر سیاسەتا فرەخوازیا ئیسلامی

ل دەسپێکا دەرکەفتنا ئایینێ ئیسلامێ کوردا پەیوەندی ب ئیسلامێ ڤە کریە وئەو ئایین ب راست زانیو وەکی پەیامەکاپیرۆز وەرگرتیە ودگەل هندێ ژی کوردێن جەزیرێ درێیا پرۆسا فتوحاتا وەکی نەتەوێن دی گەهشتنە موسلمانا .

ئەو ژی ب رێیا سیاسەتا فرەاخوازیا ئیسلامی بۆ دەڤەراجەزیرێ ل سەر دەستێ سەرکردێ موسلمانا (عیاض کورێ غنم ) دسەر دەمێ خەلیفە عومەرێ کورێ خەتاب دا(خودێ ژی رازی بیت ) ، کو هندەك ژێدەر دەست ب سەر داگرتنا باژێرێن جەزیرێ ڤەدگەرینە سالا (١٦ك-١٨ك) یا گرنگ کو دڤێرێدا باس لێبکەین ئەوە دەمێ موسلمان هاتنە کوردستانێ و کورد موسلمان بووین وهندەك موسلمانێن عەرەب ل باژێرێن کوردا هاتنە خوجهکرن .

ل سەر دەمێ خەلیفە عومەرێ کورێ خەتابی (خودێ ژێ رازی بیت ) دەست ب سەر هەمی باژێرێن کورد خوجهێن . جەزیرێدا گرت وەکی باژێرێ (راس العین ،نەسیبین ،میافارقین ،ئامەد ،روها ، ماردین ، دار، جەزیرا ئەکراد (جەزیرا ئیبن عومەر) بازیدی ،زۆزان وئەرزەن) ، ئەو باژێر هەمی ژی لسەر دەستێ سەکردێ موسلمانا(عیاض کورێ غنم ) دەست بسەردا گرت وژ دەستێ رۆما دەر ئێخستن وبڤی شێوەی ئایینێ ئیسلامێ ل باژێرێن هەرێما جەزیرێ بەلاڤبوو.

ب ئێك گەهشتنا کوردێن شارەزوور وباژێرێن کورد خوجهێن دی ڤەدگەرتیە سالا(١٦ك/٦٣٧ز) دزڤرێت ، ئەو ژی ژبەر وی لەشکەرێ هاشمێ کورێ عەتبە کورێ ئەبی وەقاص بوو یێ بەرەڤ جەلەولا دهات ، هنگێ ئەو باژێرێن کوردی د بن دەسهـ لاتا ساسانیا دا بوون ،ژ ئەنجامێ

شەرەكێ خويناوى موسلمان سەركەفتن، وى لەشكەرى ڕاهێلا لەشكەرێ شكەستيێ ساسانيا هەتا گەهشتيە حەلوان (قەسر شيرين ) ل سالا (١٧ك/٦٣٨ز) هندەك ژێدەر ئامازێ ب وێ چەندێ دكەن كو سەكردە هاشم كوڕێ عەتەبە كورێ ئەبى وەقاص شيا دەست بسەر بندنيجين (مەندەلى) دا بگريت. وپەيمان دا ئاكەنجيێن وى بازێرى سەر وسامان وگيانێ وان بپارێزيت، ب مەرجەكى باجێ بدەن ،ل داويێ شيان دەست بسەر دقوقا° (داقوق) وخانيجار (دوزخورماتو) پاشى ژى بجرمێ (كەركوك) دا بكرن .

لەشكەرەكێ دى ب سەركرتدايەتيا (جەرير كوڕێ عەبدوللاٚ بجلى) بەرف خانەقين چوو، وپشتى دەست ب سەر خانەقينێ دا گرتێ ئەو لەشكەر بەرەف حەلوان چوو،ل سالا(١٩ك/٦٤٠ز) دەست ب سەردا گرت ب ئەگەرا پەيدابوونا ئاشتيێ دناڤبەرا كوردا وموسلمانا دەڤەرێن موسڵ وبادينان وهەولێلر وشارەزوور ژى لسەر دەستێ عوتبە كوڕێ فەرقەدى هاتنە گرتن لەشكەرەكێ دى ب سەركرداتيا (ئەبو موسا ئەلئەشعەرى) كو پێكهاتبوو ژ خ وجهێن بەسرە ، شيا ب رێيا نەهاوەند بەرف بازێرێ دينەوەر بچيت ول سالا(٢٠ك/٦٤٢ز) دەست بسەردا بگريت و ژ دەستێ ساسانيا دەربيخيت ،ل دەسپێكێ ئەو دەست بسەردا گرتن ب شەڕى بوويە ، ل داويێ بريار‌دا كو باجێ بدەنە موسلمانا ولسەر ئايينێ خوٚ بمينن ، دشەرێ نەهاونددا (٢٢ك/٦٤٤ز) كو لسەر ئاخا كور دا روودا بوو موسلمانا سەركەفتنەكا ئێكجار مەزن ب سەر كردايەتيا (النعمان كوڕێ مقرن المزنى) ب سەر ساسانيادا ب دەست ڤەئينـا ، كو(فاروزان)ى سەركردايەتيا وان دكر ، ئەڤ شەڕە ب(شەڕێ سەركەفتنێ يێ شاهێ سەركەفتنا) دهێتە نياسين.

## دەست ب سەردا گرتنا مسرێ ل (٢٠ك/٦٤٠ز)




پشتي كو دەست ب سەر پشكەكا زۆر ژ ولاتێ شامێ وعيراقێ دا هاتيە گرتن وژ رۆما وساسانيا هاتيە ستاندن ، ب بريارا خەليفە عومەرێ كورێ خەتابێ (خودێ ژی رازی بيت) لەشكەر ب سەركردايەتيا (عمرو كورێ عاص بەرف مسرێ چوو) ، بيابانا سينا بری وبێ شەردەست ب سەر هندەك باژێرا دا گرت وەكی باژێرێ عەريش، موسلمان تووشي چ شەرا نەبوون هەتا گەهشتينە باژێري فەرما (الفرما) باژێرەێ كەڤن وشيرهە دارێ موكوم بوو ، ووەك بەندەرەكێ هەلكەفتی ژی دكەفتە سەر رەخيێ روبارێ نيل.

موسلمانا ئەو باژێر بۆ ماوێ هەيڤەكێ پتر دورپێچكر ، پشتي هنگێ شيان دەست ب سەر دا بگرن پاشي باژێرێ بابليۆن (مەلبەندێ لەشكەرێ بيزەنتيا) وباژێرێ ئەسكەندەريە گرتن، باژێريێ داويێ ژی (فوستات) بوو، ئەو باژێر ژی بۆ بنگەهێ لەشكەرێ ئيسلامێ وپايتەختێ مسرێ .

## پرسیارێن پشکا دووێ

پ١/ ئەڤان پێناسە بکە: ١/ خەلیفە ٢/ لێڤەبووی ٣/ شەرێ فتوحات ٤/ یەرموك

٥ / شەرێ قادسیە ٦/ دیوان ٧/م والی ٨/ خەوارج

پ٢/ باسێ رۆلێ خەلیفە عومەرێ کورێ خەتابی (خودێ ژی رازی بیت) بکە دشەرێ فرەخوازییێدا .

پ٣ / ب کورتی باسێ دەست ب سەردا گرتنا قودسێ بکە .

پ٤/ نیشانا راست () ل بەرامبەر پرسیارا راست ونیشانا شاش (X) ل بەرامبەر پرسیارا شاش دانە وشاشیان ژی راست بکە .

١- ئێکەم کەس ژ زەلاما کو باوەری ب پێغەمبەر(س.خ) ئینای خەلیفە عومەرێ کورێ خەتابی بوویە.

٢- ئەبو بەکرێ سەدیق ب خەلیفێ دووێ یێ موسولمانا دهێنە هژمارتن.

٣- شەرێ لێڤەبوویا ل سەر دەمێ خەلیفە عومەرێ کورێ خەتابی بون.

٤- بتنێ ئەگەرێ بزاڤا لێڤەبوویا ، هەلگراوا نەدانا زەکاتێ بوو.

٥- موسولمان و ژناڤبرنا لێڤەبوویادا دسەرکەفتی نەبوون.

## بەندێ سیێ

## کوردستان ل سەر دەمێ ئیسلامێ

### ئێک / کوردستان ونێکەمین پەیوەندیێن کوردا ب ئیسلامێ :-

ئاینێ پیرۆزێ ئیسلامێ کو ل دەسپێکا سەدا حەفتێ زایینی ل نیمچەی گزیرتا عەرەبی دەرکەفت بەر بەلاڤبوو، پاشی ب رێیکا خودان باوەرا ولە شکەر لەشکەرکێشیا ئیسلامێ گەهاندە دەرڤەی نیمچە گزیرتێ دەڤەر ل دوویڤ دەڤەرێ ڤەگرت و دناڤبەرا گەلێن جودا جودا دا بلاڤ بوو ، میللەتێ کورد ئێک ژوان میللەتا بوو کو زوو باوەری ب ئایینێ ئیسلامێ ئینا .پەیوەندیێن کوردا ب ئیسلامێ ڤەب دوو رێیکا بوون ئەوژی ئەڤەنە

١- پەیوەندیێن کەسایەتی وسنوردار کو خو دهەلویستێ جابانێ کوردی دا دبینتە ڤە کۆ وەکی کوردەك ب خزمەتا پێغەمبەری(س.خ ) گەهشتیە وباوەری ب پەیاما وی ئینایە وەکی ئێك ژ هەڤالێن وی بەرنیاسە ، کورێ وی ژی کو ب ئەبو بەسیر ناڤ دارە ، چەند گۆتنێن پێغەمبەری ڤەگێراینە (رابویە کرینە).

٢- پەیوەندیێن بەرفرەه وراستەو خۆ : کو لسەر ئاخا کوردستانێ هەر دگەل هاتنا سوپایێ موسلمانا ل سالا ١٦ك دەسپێکریە هەتا سالا(٢٥) ێ کۆچی ڤەکێشایە ، پتریا کوردستانی کەفتە بن دەستێ سوپایێ ئیسلامێ ، بەلێ رازیبوونا کوردا ب ئیسلامێ و وەرگرتنا بنەمایێن ئیسلامێ بتنێ د وی ماویدا نە بوویە، بەلکو پشتی هنگێ ب چەندین سالا درێژی هەبوویە.

## دو/ كاريگەريا فتوحاتێن ئیسلامێ لسەر كوردستانى:-

ئەم دشێین ب كورتى كاريگەرێن لەشكەر كيشيا ئیسلامێ بۆ سەر كوردستانێ دناڤ چەند خالا دا بەرچاڤكەین:-

١- ژلایێ بیرو باوەرێن ئایینی ڤە :بۆ ئەگەرێ دەسپیكاڤۆ ناغەكا نوى دمێژوویا كوردستانێدا كو تێدا پتریا میللەتێ كورد پیچ پیچە ژ ئاینێن بەرێ (زەردەشتى ، مەسیحی، جوهیاتی، هتد... ) ڤەبوون وباوەرى ب ئایینێ ئیسلامێ ئینا ب ڤێ چەندێ ژى بنەما وزەمینەوكا نوى ژلایێ رەوشتى جهانبینى وسەرەدەریا مرۆڤایەتی...هتد بۆ پێك ئینان .

٢- ژلایێ سیاسي ڤە: دەسەلاتا ئیسلامێ د دەڤەرێ دا هاتە چەسپادن ول وێرێ داوى ب دەسەلاتا ساسانى وبیزەنتیا ئینا كو كوردستان بۆ خۆ خوشكر بوو، ب ڤێ چەندێ ژى رێ هاتە خۆشكرن بۆ دەركەتنا دەسەلاتا خو جهى ل كوردستانێ.

٣- ژلایێ ئابوورى ڤە : بۆ ئەگەرێ گرێدانا كوردستانێ ب دەولەتەكا زلهێزو وبەرفرەه ، ب ڤێ چەندێ دەرگەه بۆ كوردستانێ ڤەبوون وپەیوەندیێن ئابوورى وتایبەتی یێن بازرگانى گەشەكر، هەر وەسا پیشە وكارێن چاندنێ ڤە ژیان .

٤- ژلایێ جڤاكى ڤە : پشتى كوردستان بوویە بەشیك ژ دەولەتا ئیسلامێ ئێدى تێكەل یا كوردا ومللەتێن دى یێن موسلمان ب تایبەتی عەرەبا زێدە بوو ، وكۆمەلكا هۆز وعەشیرەتێن عەرەبا ل كوردستانێ ئاكنجى بوون ، تێكەلى دناڤبەرا

وان وكوردا دا چێبوون ، هەر وەسا ژلایێ ئاكنجینا ڤە رێژا عەرەبا ل كوردستانێ زێدە بوو وهندەك جهێن ئاڤەدانكری یێت كوردستانێ ب ناڤێ خو بناڤكرن.

**چالاكی**

گرووپەك ژ قوتابیاب پەنابرنا بەر ئەتلەسی وژێدەران بە هاریكاریا مامۆستای ...نەخشێ بەر فرەهبوونا ئیسلامێ ل كوردستانێ ئامادە بكەن .

## هەرێمێن كوردی لسەر دەمێ ئیسلامێ

ل دەسپێكا پەیدابوونا ئایینێ ئیسلامێ وولاتێ كوردا ناڤەكێ دیار كری نەبوو كو بۆ هەمی وولاتێ كوردا بهێنە ب كار ئینان وەكو وان گەشتیارو ولاتناسێن موسلمان ئەوێن جیهان دیتین مرۆڤێن موسلمان ل سەر چەند هەرێما دا دابەش كرینەڤێجا ژبەر هندێ ئاخا كوردا دشەش هەرێمادا جهێ خوە كریە وب ڤێ شێوەی:—

**١- هەرێما چیا :**

دگۆتە دەڤەراەكا چیای وپان و ب زنار كو ژلایێ رۆژ هەلاتێ ڤە دگەهشتە سنۆری خوراسان وهەرێما فارس وئەسفەهانی، وژلایێ رۆژ ئاڤای ڤە هەڤسویا ئازر بایجان وجەزیرە ل عیراق بوو، بەلێ ژلایێ باكوری ڤە سنورێن وێ لگەل هەرێمێن دیلەم وگەیلان بوون ، ل باشوور ژی هەرێما خوستانێ وپارچەكا عیراقێ پێك دئینا .

ل ناڤە راستا بەشێ روز ئاڤایێ هەرێما چیا كورد خوجهبوون . و دكەڤندا ب دەڤەرا (میدیا) هاتبوو ناڤكرن ، دیارترین بازێرێن وی : دینەوەر ، قرماسین ئانكو (كرماشان ) حەلوان ،شا پورخواست ، شارەزوور، نەهاوەند.

ناڤدارترین ئەو هۆزێن کوردی یێن ل وێرێ ئاکنجی بووین : برزیکانی، شازەنجانی، جوزەکان، ماجەردانی.

## ٢- هرێما ئازەر بایجان :

ئەو هەرێمە کو بەشەکێ زۆر ژێ ئاکجبیێن وێ کورد بوون ، ل باشوور هرێما چیا ول باکوری رووباری ئاراس ول رۆژ هەلاتی هرێمێن دەیلەم وگەیلان ولرۆژ ئاڤای ئەرمینیا وبەشەکێ جەزیرێ هەرێمێن وان پێك دئینان و دکەڤندا دگۆتێ (ئەتروپاتەکان) یان ژی (ئاتروپاتین).ناڤدارترین باژێرێن هەرێما ئازر بایجان .تەبرێز، شنوچ مەراغە ورمێ.

دیارترین ئەوهۆزێن کوردا یێن ل وێرێ ئاکنجی بووین :هەزبانی ، زرزاری، جەلالی، سۆلی.

## ٣- هەرێما جەزیرە:

ب ژۆریا ولاتێ میسوۆپۆتامیا بەردهاتە گۆتن ب تایبەتی ئەو دەڤەرێن دکەڤنە دناڤبەرا هەردورووبارێن دیجلە وفورات سنۆرێ رۆژ هەلات ورۆژ ئاڤایێ هەرێمێ پیك دئینن، وهەردو باژێرێن هیت وتکریت ل باشووری وئەرمینیا وولاتێ رۆم ل باکوور هەڤ سنۆرێن جەزێرێبوون.

باژێرێن ناڤدارێن جەزیری ئەڤەنە : هەولێر ،موسڵ، ئامەد، روها، میافارقین ، رأس العین ، جەزیرا بۆتان .

بارا پترا هەرێما جەزیرێ کورد بوون وب تایبەت کو عەشیرەتێن بەرنیاسێن وەکی: پەشنەوی ،حار بوختی، هەزبانی، جوبی، حەمیدی .

**٤- هەرێما ئەرمينيا :**

بەشێ باكوور و رۆژ هەلاتێ ولاتێ كوردان ل لايێ ولاتناسێن ئيسلامى دكەڤيتە هەرێما ئەرمينيا كۆ ژلايێ باكوورى ڤە ولاتێ گورج وژباشوورى ڤە ئازربايجان وجەزيرە وژ رۆژ هەلاتى ڤە هەرێما ئاران وژ رۆژ ئاڤا ڤە ولاتێ رۆم وباكوورێ جەزيرە توخيبێن وى پێك دئينن ، ناڤدار ترين باژێرێن هەرێما ئەرمينيا ، ئانى ، دبيل، بەدليس، خەلات.

ديارترين هۆزێن كوردى ل ئەرمينيا ، ڕۆژەكى ، ڕەوادى ، بوختى، زومان و كردكى.

**٥- هەرێما خۆزستان:**

ئيك ژوان هەرێمێن سنۆردارە كو د ناڤەراست و باكووريدا كوردێن زۆر هەبوون ، ژلايێ باكوورى ڤە دەڤەرێن كوردستانێ وهەرێما چيا، وژلايێ باشوورى ڤە دەڤەرێن عەبادان و (كەندار) . وژلايێ رۆژهەلاتي ڤە هەرێما فارس وژلايێ روژئاڤاى ڤە عيراق سنۆرێ هەريما خۆزستانێ پێك دئينا باژێرێن بناڤدار:رامهورمز ،جنديشيا پور ، ئەهواز.

ژبلى وان هەرێمێن كو هاتينە باس كرن كورد ل چەند دەڤەرێن ديترێن ڕۆژهەلاتێ دەولەتا ئيسلامێ هەبوون يا ژهەميا ديارتر هەرێما فارس بوو كو دكەڤيتە ژێريا ئيرانا نهۆ ، باژێرێن شيراز ودارا بجرد وئەستەخر ،ژگرنگترين باش مێرێن هەرێمێ فارس ، لبەر گۆتنا ميژوو نووسا هەرێمێ دا پێنجسەد هزار مال وكاڤلێن كوردان هەبوون كو گۆتنێ زۆم يان زمومى كوردان .

## راپەرینێن کوردا ل سەردەمێ ئیسلامێ :

پشتی ئایینێ ئیسلامێ دناڤ کوردا دا بەلاڤ بووی ، کورد بوونە بەشیک ژ دەولەتا ئیسلامی وراستە وخۆ کەفتنە ژێر کاریگەریا سەردەدریا سیاسیانەیا دەولەتا ئیسلامی ئیك ل دویف ئێکێ(راشدی ،ئەمەوی ،عەبباسی) جار جارە ل هندەك جهێن کوردستانێ راپەرین دژی دەسەلاتدارێن ئەمەوی وعەبباسی هاتنە کرن ، ئەڤ راپەرینە ب دوشێوازا بەرڤ چاڤدبوون :–

١– بەشداریا کوردا د راپەرین وبزاڤێن وەکی خەوراج، عەلەوییان .... هتد .

٢– راپەرین وبزاڤێن تایبەتێن کوردی کو دژی دەسەلاتداران هاتینە کرن . ب کورتی دێ باسێ هەر ئیك ژڤان کەین:

### ١- بەشداریا کوردا د بزاڤێن خەوارج وعەلەوییاندا :

خەوارج گرۆپەکا ئایینی سیاسی ئیسلامی بوون کو د ململانا دناڤبەرا خەلیفە عەلی کورێ ئەبی تالبی (خودێ ژێ رازی بیت) وموعاویە کورێ ئەبو سوفیانی دا پشتەڤانێن کەسێ نەبوون ودگۆت حوکم کرن بتنێ بۆ خودێ یە ودگۆتە خو شوراتەکان وپشتی دەرکەفتنا وان پەنا بۆ شارەزوور بر وێرێ دژایەتیا خۆ بۆ ئەمەویا دەربری ،دیارە هندەك ژ کوردێن شارەزوور پشتەڤانیا خەوارجیا دکر ، هەر وەسا د سەر دەمێ عەباسیادا کوردا د چەند بزاڤێن خەوارجا دا دژی عەباسیا بەشداری کرد و یاژ هەمیا ناڤدارتر بزاڤا مساورێ کورێ عەبدوحەمیدێ شاری بوو ل سالا ٢٥٢ کۆچی ٨٦٦زایینی کو ل ندەڤەرێن جەزیرە سەرهەلدا

کوردێن دەوروبەرێن موسل وشارەزوور پشکداری تێدا کریە .سەرکەفتنەکا بەر چاڤ دژی عەباسیا بدەست ڤە ئینایە ، سەرکردێ کوردێ دیار د ناڤ ڤێ بزاڤێدا محەمەد کورێ خورزاوی کوردی بوو .

بەلێ عەلەویا کو سەر کردێن وان ژ بنە مالا پێغەمبەری(س.خ) بوون دوێ باوەرێدا بون کو تنێ ئەو هەژی هندێ نە ببنە خەلیفە نە کو ئەمەوی وعەباسی لەورا د درێژایا مێژوویا ئیسلامێدا بزاڤێن عەلەویادبەر دوام بووینە،هندەك جارا کوردا ب ئەگەراوێ سوز ودلگەرمیا بەرامبەر عەلەویا هەی یان بۆ نیشاندانا نەرازیبوونا خو دژی دەولەتێ پشکداری د وان جوڕە بزاڤا دا کریە . ل سالا ١٢٢ کۆچی کوردێن شارەزوور پشکداری دوان راپەرینێن عەلەویا دا کریە کو ب سەروکاتیا زەیدێ کورێ عەلی بوو دژی ئەمەویا ، کوردا ل سەر دەمێ عەباسیا ژی دا ل نیڤا دووێ ژ سەدا سیێ کوچی ، نەهێ زاینی پشکداری بزاڤەکا عەلەویا دا ل دەڤەرێن ئازەربایجان هەر وەسا قەرامتیا کو گرۆپەکا عەلەویا بوون ل نیڤا دووێ یاسەدا سیێ کۆچی ل دەڤەرێن کوفە دەرکەفتن ،

ئەوان ژی د ناڤ کوردا دا بشتەڤان هەبون وسەر کردە جەعفەرێ کورێ حەمیدێ کوردی ژ رێبەرێن ڤێ بزاڤێ بوویە .

**٢- راپەرین وبزاڤێن تایبەتێن کوردی:**

ئەو رابەرین وسەرهلدانێن ژ دژی وێ زلم وزورداریێ بوون ئەوا ل ناڤ کوردا دا هەیی کو ژ بێخەمی وبێ سەروبەریا دەسەلاتا عەباسیا پەیدا بوویە

سەر كردێن ب كێرهاتی ومێرخاس فەرماندێن ڤان راپەرینا بوون كو یێن ژهەمیا دیارتر ئەڤەبوون:

**چالاكی /**
گرۆپەك ژ قوتابیا بەلاڤوكەكا سەر دیواری بەرهەڤ بكەن ، باسێ وان راپەرین وشورەشێن كوردی بكەن ئەوێن ل سەر دەمێ ئیسلامێ پەیدا بووین.

**أ- راپەرینا كوردێن دەور وبەرێن مویسلێ :**

ل سالا٢٢٤ كۆچی /٨٣٩ زاینی كوردێن روژ هەلاتا مویسلێ دژی دەستهەلات دارێن عەباسیا د وێ دەڤەرێدا سەرهلدانە . سەر كردێ راپەرینێ جەعفەر كورێ میر حەسەنێ كوردی بوو ، كو ل دژی زولم وزۆرداریێ وتەپەسەر كرنێ بوو ژلایێ والیێن عەباسیا ل دەڤەرێدا ، چاكی ومەردینی لادابو ژبەر ڤێ چەندێ كورد دژی وان رابون .

جیایێ داسن مەلبەندێ بەرخودانا راپەرینێن كوردا بوو خەلیفێ وی سەر دەمی یێ عەباسیا ئەلموعتەسم هەست ب مەترسیا ئەڤێ راپەرینێ كریە سەركردەك ب ناڤێ عەبدوللای ئەزدی رەوانەی مویسل كر بو ناڤ برنا سەرهلایا كو ل ناڤ چیایێ داسندا ل گەل كوردا شەركر وسوپایێ وی شكەستن ئینا و(عەبدللای ئەزدی) بخو ژی هاتە كوشتن .

ئەڤ راپەرینە هەتا سالا٢٢٧كۆچی /٨٤٢ زاینی یابەر دەوام بوو دوێ سالێدا سەرهلدایێن كوردا نەشیان بەرامبەری لەشكەرێ زۆر بهێزێ عەباسیا خو بگرن لەورا خو پاشڤە كێشا وئۆمێدا سەركەفتنا وان كێم بو ، ژبەر هندێ سەركردە جەعفەر خو نەدا دەستێ وان و ژەهر ڤەخار .

### ب- بزاڤا شەدادێ کوردی:

دەڤەرا حەسەینیێ زاخوو بۆتان ل سالا ٢٨١ کۆچی /٨٩٤ زاینی ب سەروکاتیا شەدادێ کوردی ، ل بەرامبەر دەسهەلات دارێن عەباسیا دل دەڤەرێ سەرهلدان کرن ، زۆرکوردا پشکداری دڤێ بزاڤێدا کربوو هژمارا وان نزیکی دەه هزار کەسا بوون ، ژبەر هندێ مەترسیا ڤێ رسەرهلدان یازۆر بوو ، ژبەر هندێ خەلیفێ عەباسی ئەلموعتەز ید بخو ب سەرکردایەتیا سوپاییێ عەباسیا رابوو شیا داوییێ وێ سەرهلدانێ بینیت.

### جـ - سەرهلدانا هەزبانیا :

هۆزا هەزبانی کو ل دەڤەرێن هەولێرو رۆژ هەلاتێ مویسل خو جهبوون. ژسالا ٢٩٣ کوچی /٩٠٥ زاینی ب سەرۆکاتیا محەمەد کورێ بیلالێ هەزبانی، سەرهلدان دژی والیێن عەباسیا ل مویسل کریە وشیان رەخێ روژ هەلاتا مویسل بێخنە بن دەستێ خو .

والیێ مویسل دخورا نەدیت بەرسینگێن کوردین هەزبانی بگریت لەورا داخازا هاریکارییێ ژخەلیفێ عەباسی ئەلموکتەفی کرن دەمێ هەزبانیا ب ڤێ چەندێ زانی باشڤە کێشان بۆ دەڤەرا شارەزوور و دانوستاندن لگەل والیێن عباسیا ل مویسل کرن ، محەمەدێ کورێ بیلالی سەرکردێ هەزبانیا دلسوزیا خو بۆ وان دەربری ، ئارمانج ژڤێ ئەڤە بوو.

١-دا سوپاییێ عەباسی مژیلکەت وژشەری سارکەت .

٢- دا هەزبانی خو بەرهەڤکەن ومال وزارۆکێن خو رزگار کەن .

دوی ماوەیدا هەزبانی گەهشتبوونن جیایێ قەندیل وجارەکا دیتر شەر لگەل عەباسیا کر وهندەك ژ هەزبانیا ڤەگەریانە دەڤەرا هەولێری و هزاران مالباتێن دی ژوان ئاوارە بوون و دەربازی هەرێما ئازربایجانێ بوون ول وێرێ مان.

## مێرنشینێن کوردی:

ل سەر دەمێ چارێ کۆچی ودەهێ زاینی بزاڤا سەربەخویا کوردا وەرارەکا بەرچاڤ کر چەند میرنشینەکا ژی دروست بوون، هەر ئێك ژوان خودان سەروەریا خوبوون وب سەرکەفتیانەخزمەتا وەلاتێن کوردەوارییێ دکر .

گرنکترین هۆکارێن سەر هلدانا میرنیشیێن کوردا ئەڤەنە :

١- هەبوونا گیانێ سەربخو ییێ وهەولدان بۆ رزگار بوونێ ژبن دەستێ ستەمکارا و هەبوونا ئێك گرتنا هۆزێن کوردی د وی سەر دەمیدا ئەگەرەکا هاریکار بوو بۆ بەرفەرهبوونا دەستهەلاتا سیاسیا کوردی.

٢- شەیرزەیی ونە ئارامی ولاوازبوونا دەولەتا عەباسیا وبەلاڤبوونا گەندەلیا سیاسی وکارگیری وئابوری د هەمی دام ودەزگەهێن واندا ل داوییێ لاوازبوون وژبەر ئێکبوونا دەولەتا وان چەند هەرێم ودەڤەر ژێ جودا بوون .

٣- سروشتێ جوگرافییێ وەلاتێ کوردا وەکی هەبوونا چیا ونهالاً وزۆر جهێن ئاسێ وزەحمەت هاریکاربوون بۆ پێکئینانا دەست هەلاتا سیاسیا کوردی.

٤- هەبوونا بارێ گونجاییێ ئابووریا جڤاکی ناڤ جڤاکییێ کوردیدا ل وی سەر دەمی کو رێ خۆشکەربوو بۆ خەملانا سیاسیا نوی.

## دیارترین میرنشینێن كوردی ل سەر دەمێ ئیسلامێ :

### ١-مێرنشینا رەوادی:

ل دەورووبەرێن سالا ٣٣٧ كۆچی/ ٩٤٨ زاینی میرنشینا رەوادی ل هەرێما ئازربایجانێ ل سەر دەستێ میر محەمەدێ كورێ حسینی هلتیە دامزران كو سەرۆكێ عەشەرەتا رەوادیا كوردی بوویە ، شیایە دەستهەلاتا خو بچەسپینیت ول ئازربایجانێ فرەخوازیێ بكەت .

## ناڤدارترین میرێن نەڤێ میر نشینێ

میر حسێنێ كورێ محەمەدی (ئەبولهەیجایێ رەوادی) كو ل سالا ٣٤٥ كۆچی ٩٥٦ زاینی باژێرێ تەڤریزێ ستاندو بشتی هنگێ كره پایتەختێ میرنشینا خو.

=میر ئەبولهەیجایێ دووێ شیا هەمی ئازربایجانێ بێختنە ژێر دەسهەلاتا میرنشینا خور هێرشێ بكەتە سەر ئەرمینیا ، زۆر پویتە ب ئاڤەدانی وخزمەتا زانینێ وفێربونێ دایە .

= میر محەمەدێ هسوزان یێ بەرنیاس ب (مەمەلان) كو ل سەر دەمێ هاتنا سەلجوقیا میربوویە سولتان توغرول بەگێ سەلجوقی دان پێدان ب دەسهەلاتا وی كریە، بەلێ هەر ب كار تێكرنا سیاسەتا نە گونجایا سەلجوقیا ل سالا ٤٦٣ كۆجی/ ١٠٧١ زاینی میرنشینا رەوادی هەرفیتە .

### ٢-میرنشینا شەدادی:

ئەڤ میرنشینا كوردی ل دەسپێكا سالا ٣٤٠ كۆچی /٩٥١ زاینی ل دڤەرا ئاران كو دكەڤیتە ناڤبەرا هەردو هەرێمێن ئازربایجان وئەرمینیا ل ژلایێ دی یێ روبارێ ئاراس دەركەفتیە.

شەدادی بنە مالەکا کورد بوون ژ هۆزا رەوادی کو سەر کردێ وان محەمەدێ کورێ شەدادی ب دامەزر ێنەرێ ڤێ میرنشینێ دهێتە هژمارتن کو بو جارا ئێکێ ل بازێرێ دبیل سەر هلدا .

## ناڤدارترین میرێن میرنشینا شەدادی:

میر لەشکرێ کورێ محەمەدی کو ماوێ هەشت سالا حوکم کرە و میرنشینا خو بەرفرەهکریە وزۆر بازێر و دەڤەر گەهاندینە میرنشینا خو :

١- میرفەزلۆنێ کورێ محەمەدی کو ماوێ (٤٥) سالا میراتی کریە، وزۆر ب پویتە ب باشکرنا پەیوەندیێن ژ دەرڤەیێن میرنشینا خو کریە و گرنگی ب چاککرنا رێ وریبارا دایە و پرەك لسەر رووباری ئاراس دروست کریە . ژ سالا٤٢٢ کۆچی/١٠٣٠ زایینی میرشاور ئەبو سوار کوردێ فەزلون ئێك ژمیرێن مەزنێن شەدادیا ب زەلامەکێ دادپەروەر وبجەرگ دهاتە نیاسین د سەر دەمێ ویدا سەلجوقیا هێرش کرە سەر وەلاتێ وی .

٢- پشتی کو دەسهەلاتا شەدادیا لدەڤەرێ لاواز بووی سەلجوقیامەترسی لسەروان دروست کر هیدی هێدی ل هەرێما ئەرمینیا هێزا وان زێدە دبوو لەوراپایتەختێ میرنشینایێ بو بازێرێ ئانێ ل ئەرمینیا هاتە ڤەگوهاستن ول وێرێ ژی چەندین میرێن ب ناڤ ودەنگ میراتی کریە ودەسهەلاتا شەدادیا حەتا سالا ٥٩٥ کۆچی بەردەوام بوویە و ب دەستێ مەغولا هەرفتیە.

### ٣- میرنشینا حەسەنوەیهی :

ئەڤ میرنشینە ل سەر دەستێ میر حەسەنوەیهی کورێ حوسێنێ کوردی هاتیە دامەزراندن کو سەروکێ هۆزا بەرزیکانی بوو ل هەرێما چیا .

مێژویا دامەزراندنا وێ ڤەدگەریت بۆ سالا٣٤٨ کۆچی / ٩٥٩ زاینیی، باژێرێ (شاپورخواست ) ل دەڤەرا لورستان پایتەختێ میرنشینێ بوو.

## ناڤدارترین میرێن وێ

میر حەسەنوەیهی کو هەتا سالا٣٦٩ کوچی/ ٩٧٩ زایینی میراتی کریە بو گەلەك ژیرانەپەیوەندیین سیاسی دگەل بوەیهیا بهێز کرینە وشـایە چەندین هۆز ودەڤەرێن جودا جودا یێن کوردی بێخیتە سەر میرنشینا خو .

میر بەدر کورێ حەسەنوەیهی کو پشتی بابێ خو دەسهەلات وەرگرت میرەکێ گەلەك هێژا و بکاربوو ، سەنگەی سیاسیێ یابەرجاڤ د دەڤەرێدا هەبوو ، زێدەتر ژ سیە وپێنج سالا میرێ میرنشینێ بوو . زەلامەکێ زیرەك ومەرد و خێر خواز بوو ، ل سەر دەمێ حوکمێ وی دەڤەرێن لورستان ودینەوەر وکرما شان و هەمەوان وشارەزور وباژێرێن دیترێن کوردی وەراو ئاڤادانیەکا بەرفرەه بخوڤە دیت.

میر بەدر گەلەك زوی دهەوارا جوتیار و وەرازێن وەلاتی دچوو دژی زۆر داریا دەرەبەگا وهاریکاریا هەژارونەدارا دکر ، پارە وجل وبەرگ لسەر بەلاڤەدکرن .

مەردینیا وی گەهشتە رادەکێ وەسا خەلکێ بەغدا وحیجازێ ژێ ژێ بێ بەهر نەبوون .

میر بەدر چ جارا ریێ نەد دا لەشکەر وکار بە دەستێن خو زۆر دارییێ ل کەسەکی بکەن ، ل ئەوێن مافێن وان دهاتنە خوارن دپرسی وماڤێن وان بۆ دزڤراندن ، وگەلەك گرنگی بریێ وریبارا د دا وشوینوارێن وی یێن مێژوویی ل پاش وی ماینە .

میرنشینا حەسەنوەیهی پشتی مرنا میر بەدر ل سالا٤٠٥ كۆچی / ١٠١٤زایینی بەرەڤ لاوازییێ چوو میرێ داوییێ میر تاهرێ کورێ هیلال کورێ بەدری بوو بتنێ بۆ ماوێ ئێك سال میراتی کر و ل سالا ٤٠٦ كۆچی /١٠١٥ زایینی دەسهەلاتا ومیرنشینێ ب داوی هات ومێر نشینا عەنازی جهێ وێ گرت .

## ٤-دەولەتا دۆستەکی مەروانی:

ئەڤ دەولەتە ل دەڤەرا دیاربەکر ل دەوروبەرێ سالا (٣٧٣ كۆچی - ٩٨٣ زایینی) وەکو دەسهەلاتەکا سیاسي پەیدا بوو ، دامەزرێنەرێ ڤێ دەولەتێ میر بادێ کورێ دۆستەکی کوردییە کو شیایە ژبلی دەڤەرێن دیار بەکر هندەك بازێرێن هەرێما ئەرمینیا ژی بێخیتە بن دەستێ خو وبۆ ماوەکی فەرمانرەواییا بازێرێ موسلێ ژی کریە .

میر بادل سالا(٣٨٠ کوچی/٩٩٠ زایینی) وەغەرکریەخوارزایێن وی دەسهەلاتا دەولەتێ وەرگرتن وبڤی شێوەی بنە مالا مەروانی دبنە میرێن دەولەتێ .

**راهێنان**

ناڤ دارترین میرنشینێن کوردی ، میرنشینێن

| رەوادی | و | | و | |
|---|---|---|---|---|
| | و | | و | |

## ناڤدارترین میرێن دەولەتا دۆستەکی   مەروانی

-میر ئەبو عەلی  کورێ مەروانی کو زۆر خودان شیان بوو ، وشیا ب لێزانین جهێ خالێ خو(باد)ی بگرێت و بازێرب بازێر ودەڤەر بدەڤەر بیخیتە بن دەستێ خو.

-میر مومەهد ئەلدەولە کورێ مەروان کو ل سالا(٣٨٧ کۆچی/٩٩٧ زایینی) بوو میرێ دەولەتێ شیا  دەسهەلاتا خو بهێز بێخیت دناڤ هێزێن دیارێن دەڤەرێدا (بێزەنتینی وبوەیهیا) دانپێدان ب دەسهەلاتا وی کر وخزمەتێن بەر چاڤ کرینە دبیاڤێن ئاڤەدانکرن وزانست وزانیاریادا .

-میرنەسرولدەولە ئەحمەدێ کورێ مەروانی کورێ ئێك ژمیرێن ناڤدارێن کوردە د سەدێن ناڤەراست دا ول سالێن (٤٠٢ -٤٥٣ کۆچی /١٠١٢ -١٠٦١ زایینی) حوکم کریە ،د سەردەمێ وی  دا دەولەت ل گۆپیتکا قۆناغێن وەرارا سیاسی وشارستانی  دا بوو ، کارێن وی  د رۆژ هەلاتێ ئیسلامێ دا دەنگ ڤەدا بوو ، خودان لەشکەرەکێ بهێز ودام ودەزگەهێن کارگێرێن دەولەتی بوو ،وەزیرو شیرەتکار وجێگرو والیێن  شارەزا هەبوون برۆژێن جودا جودا یێن بەرفرەهکرنا بازێرا نویژنکرنا شویرها  وراگێشانا ئاڤێ بۆ ناڤ جهێن ئاکنجیا ودروستکرنا پر وکوچکا ب ئەنجام گەهاندینە.

زۆر سیاسیانە ژێپێکگەهێ هێزدارییێ  وەلاتێ خو پاراستیە وئاسایش وتەناهی دابین کریە وخەلك دژین وژیارەکا خوشدا وژیان، هەتا رادەکی دگۆتن شەڤێن سەر دەمێ حوکمێ میر نەسرولدەولە ژ رۆژێن وی خۆشتر بووینە.

پشتی هاتنا سەلجوقیا بۆ هەرێمێ وداگیرکرنا دیار بەکرو دەوروبەرێ ، دەولەتا دۆستەکی -مەروانی د قۆناغەکا لاوازیێ دا دەربازبوو هەتا سالا٤٨٩ کۆچی / ١٠٩٦ زایینی بتمامی بدەستێ سەلجوقیا داوی ب دەسهەلاتا وان هاتە ئینان.

## ٥-میرنشینا عەنازی:

ئەڤ میرنشینە ل دەڤەرا حەلوان دناڤ کوردێن هۆزا شازەنجانی پەیدابوو و وەرارکر هەتا وەلێ هاتی پشتی نەمانا میرنشینا حەسەنوەیهی بۆ میراتگرێ وێ و د هەمان وان جهێن حەسەنوەیهی تێدا دەسهەلاتدار .

ناڤدارترین میرێن میرنشینێ :

-میر ئەبو لفەتح محەمەدێ کورێ عەنازی کو ئێکەم میرێ وان بوو ل سالا(٣٨١-٤٠١ کۆچی/٩٩١-١٠١٠زایینی) میراتی کریە دەسهەلاتا خو گەهاندە خانەقین وژۆریا بەغدا .گەلەك گرنگی ب ئاڤەدانکرنێ وپاراستنا وەلاتێ خو دا دا.

-میر حسام ئەلدەولە کورێ ئەبولفەتح کو پشتی بابێ خو میراتی کریە ، وشیا درێژیێ ب رێبازا بابێ خو بدەت دخزمەتکرن ودروست کرنا پەیوەندیا دگەل هێزێن دەڤەرێ ، بەلێ ماوێ حوکمێ میر حسام ئەلدەولە ٣٦ سالا ڤەکێشا د وی ماوەیدا شەڕ و ناکۆکیێن ناڤخویی و دەرەکی کارتێکرنەکا خراب ل سەر میرنشینێ هەبوو .

میرنشینا عەنازی پشتی هاتنا سەلجوقیا تووشی قوناغەکا لاواز ژدەسهەلاتا سیاسی بوون بەلێ دەسهەلاتا سیاسیا میرنشینی ب داوی نەهات هەتا سالا٥١١کۆچی / ١١١٧زایینی.

### ٦- میرنشینا هەزبانی:

هۆزا هەزبانی کو ئێکە ژ هۆزێن هەرەمەزنێن کوردا سەر دەمێ ئیسلامێدا تێبینی دهێتە کر ن کو باژێرێ هەولێرێ ئێك ژپێگەهێن بهێزێن هەزبانیا بوویە ، ژبەر هندێ هەر ژ دەسپێکا سەدێ پێنجێ کۆچی (یازدێ زایینی) ل هەولێرێ ودەورروبەرێ وێ میرنشینا هەزبانیا هاتیە دامەزراندن کو دەسهەلاتا وێ هەتا سالا ٥٣٤ کۆچی /١١٣٩زایینی ڤەکێشایە ئەڤ قۆناغە دا مێژویا دەڤەرێدا هەلقەیەکا گەشا ودیرۆکا کەڤنا هەولێرێ پێکدئینیت .

**چالاکی /**
گرۆپەك ژ قوتابیا (راپۆرتەکێ ) ئامادە بکەن کو ژ دولاپەرا پێکهاتبیت دەربارەی دو میرنشینا ... بەرامبەر قوتابیا راپورتێ بخوینن ودان وستاندن وپرسیار دڤی بیاڤیدا بهێتە کرن .

**ناڤدارترین میرێن هەزبانیا ل هەولێرێ :**

-عیسایێ کورێ موسایێ هەزبانی .

-سالارێ کورێ موسا یێ هەزبانی .

-ئەبولحەسەن کورێ موسایێ هەزبانی.

-ئەبولهەیجائیێ هەزبانی کو میرەکێ بهێز بو، وشیا دەسهەلاتا خو دەڤەرایێدا بچەسپینیت ، پەیوەندیێن دۆستانە دگەل سەلجوقیا هەبووینە .

**پرسیار**

١-جابانێ کوردی کیە ؟

٢-دوخالا ژ کاریگەریا فتوحاتێن ئیسلامی بۆ سەر کوردستانێ بهژمێرە ؟

٣-هەرێما چیا چ دەڤەرا ڤەگرتیە ؟

٤-سێ ژباژێرێن ناڤدارێن هەرێما (جزیرێ) بهژمێرە.

## سەردەمێ دەولەتا ئومەوی
## بارودۆخێ گشتیێ دەولەتێ
## دەولەتا ئومەوی( ٤١-١٣٢ك )

**بنە مالا ئومەوی:**

ئومەوی سەرب هۆزا قورەیشیا ڤەنە ،دەولەتا وان بناڤێ (ئومەییە کورێ عەبدشمسێ کورێ عەبدلمەناف) ێ باپیرێ وان یێ مەزن هاتیە بناڤکرن ، وی ومامێ وی هاشم کورێ عەبدلەنافی هەڤرکیەکا مەزن ل سەر سەرورەریێ دکر ، ئومەوی خودان پایە وپلەیەکا بلندبوون سەروەت ومالەکێ زۆر هەبوو.

**هەلویستێ ئومەوییا بەرامبەر ئیسلامێ:**

ئومەویا هەر ژکەڤندا دل خیلافەتێدا هەبوو ،بەلێ ل سەر دەمێ ئەبو بەکری وعومەری دەلیڤە بۆ هەلنەکەفت ،پشتی کوشتنا ئیمامێ عومەر وراسپاردنا شەش کەسا بو دەستنیشان کرنا ئێکێ ژناڤ وان ، هیڤی وئۆمێدەك پەیداکر، وپشتەڤانێن ئیمام عوسمانی بوون ب ئاشکرایی ونهێنی ،

پشتی عوسمان هاتیە دەست نیشان کرن ،کارکر بۆ دامەزراندنا خیلافەتەکا ئومەوی، بۆ ڤێ چەندێ معاویەی دەست ب خو ئامادەکرنێ ب پشتەڤانیا خەلکێ شامێ .

ئومەوی دو پشکن ، پشکا (بەنوئومەییە) وپشکا (ئەبیلعاص) وپرانیا خەلیفا ژ پشکا دوێ بوون.

### ناڤدارترین خەلیفێن ئومەوی :

ل دەسپێکا دامەزراندنا دەولەتا ئومەوی ل سالا ٤١ی کۆچی هەتا کەفتنا وێ ل سالا ١٣٢ ێ کۆچی ، (١٤) چاردە خەلیفا فەرمانرەوایي کریە،یێن ژهەمیا بناڤدارتر:-

## ١-خەلیفە معاویە کورێ ئەبو سفیان (٤١-٦٠ کۆچی ):

معاویە ل مەککەهێ ژدایك بوویە ، پشتی گرتنا بازێرێ مەککە ل سالا(٨) ێ کۆچی موسلمان بوویە ، ژیێ وی ٢٣سال بوون ، پێغەمبەری حەز دکر ئەو کەسێن درەنگ بووینە موسلمان نزیکی خو بکەت وکرە نڤیسەرێ وەحي (سروش) وڤەگێڕێ فەرموودێن پێغەمبەری بوویە.

### داهێنانێن معاویەی :-

معاویە هندەك تشت داهێنان کو بەراهیێ نەبون ژوان :-

١-مقصورا نڤێژێ بۆ خو دانا، ژترسا کوشتنێ ل دەمێ نڤێژکرنێ.

٢-پۆستە رێکخست ، وهێسترا کوری بری بۆ دانا .

٣-دیوانا مۆرکرنێ دانا (دیوان الخاتم).

٤-پەردەداری دناڤبەرا خو وخەلکدا دانا.

٥-خیلافەت کرە پشتا ویشت.



## فتوحاتێن معاویەی:

سەر دەمێ معاویەی ب دەسپێکرنا فتوحاتا دهێتە هژمارتن، ود وی سەر دەمی دا شیان بگەهنە دوورترین خال ، ژ رۆژهەلاتێ گەهشتنە ولاتێ (سند) و(بوخارا)، وهەر جهەکێ دەست بسەردا گرتبا شیایە هەتا رادەکێ باش ئەمن وتەناهیێ تێدا دابین بکەت ،هێرشێن وی ل هاڤینێ وزڤستانێ دبەردەوام بووینە لسەر دێمی ورئاڤێدا ، وگرنگترین هەولێن وی بوگرتنا قستەنتینیە بووکو دۆر پێچ کریە بەلێ بدەستڤە نەهاتیە.

## یەزیدێ کورێ معاویەی(٦١-٦٤ک):

پشتی وەغرکرنا معاویەی یەزیدێ کورێ وی هاتە جهێ وی (لدویڤ سیستەمێ پشتاوپشت) چار سالا حوکمرانی کر، د وی سەر دەمیدا چەند کارێن دلتەزین روودا بووینە وبونە جهێ نەرازیبوونا موسلمانا وپارچە پارچە بوونا موسلمانا، وخەلیفێن پشتی یەزیدی ژی نەشیان چارە سەریا بار ودۆخی بکەن هەتا هاتنا خەلیفە عەبدولمەلکی کو شیا هێز وسەرووەریایێ بۆ ئومەویا بزڤرینتە ڤە.

## گرنگترین رووداں :

١-کوشتنا حوسەینێ کورێ ئیمام عەلی ل ١٠ێ محەرەما سالا٦١کۆچی ، ئەڤ رووداںە خالەکا رەشە دمێژوویا ئومەویادا .

٢-رووداںا حەرە:- ل سالا٦٣ ێ کۆچی : ئومەویا هێرش کرە سەر مەدینێ وپاشی مەککەهێ وزیانەکا مەزن گەهاندە کەعبێ دا وخەلکێ مەککەهێ ئێشاندن.

## عەبدولمەلكێ كورێ مەروانی ( ٦٥-٨٦ك )

عەبدولمەلكێ كورێ مەروانی كورێ حەكەمی ، ل سالا ٢٦ێ كۆچی ل مەدینێ ژدایك بوویە، هەر ژلاوینیا خو پویتە ب خاندن وفێركرنێ دا ، ل مەدینێ ب زەلامەكێ دیندار وتێگەهشتی ناسیار بوو ، پشتی بابێ خو بوویە خەلیفە، ل دەسپێكا هاتنا وی ولاتێ موسلمانا یێ پارچە پارچە وشەبرزەبوو ، ب هێز ودەسهەلاتا سەربازی وپشتی روودانا چەندین شەرا دژی (زوبێری كورێ عەوامی) شیا بسەردا زاڵ ببیت ودەسهەلاتا خو بسەر هەمی دەولەتا ئیسلامێدا بكێشیت ، ود ڤی شەری ژی دا دوبارە هەردو باژێرێن پیرۆزێن (مەككە ومەدینە) كەفتنە بەر هێرشێن ئومەویا .

## شورەشا عەبدولرەحمانێ كورێ ئەشعەث :

ل سالا ٨٠ێ كۆچی عەبدولرەحمانێ كورێ ئەشعەث كرە والیێ هەرێما سەجستان ل سنۆرێ هندێ (حەجاجێ كورێ یوسفێ سەقەفی) شەرێ توركا پێ سپارد بوو چونكی پشتەرێ ببوون وباج نەددا ودەست درێژی ژی كربوو سەر موسلمانا ، كورێ ئەشعەثی ب سەركەفتیانە كارێ خو ئەنجامدا وهوشداركرن وشیا ولاتێ وان ژی بگریت ، وەسا دیارە لەشكەرێ وی‌ماندی ببو ،ژبەر هندێ دڤیا ل وەرزێ زڤستانێ هندەك بهێنڤەدانێ بدەتێ ،پاشی دهاڤێنێدا جارەكا دی هێرش بكەتە سەر وان ، و دەمێ حەجاجی ئەڤە زانی گەلەك تورە بوو و ماوەیەكی پێڤەبوون رازی بكت بەردەوام بیت دشەركرنێدا بەلێ سەرنەگرت ، ئەڤەژی بۆ ئەگەرێ تێكچوونا پەیوەندیا دناڤبەرا وان دا و ئەڤەژی بۆ ئەگەرێ بەرفرەهبوونا بزاڤا الاشعث وهژمارەكا زۆر ژ مەوالیا ب تایبەتی ژ كورد وفارسا هاتنە دناڤ

بزاڤا وی دا ژبەر بێزاریا وان ژ سیاسەتا حەجاجی ، ئەو بوو الاشعث نزیك بوو ژ گرتنا عیراقێ.

ل سالا ٨٢ یێ کۆچێ ل (دیر الجماجم) ل نزیکی کوفە، ئومەویا سەرکەفتنەکا ئێکلاکەر بدەستڤە ئینا ، عەبدولەحمان ژی بەرەف ولاتێ تورکا رەڤی و ل سالا ٨٥ی کوچی بدەستێ ئومەویا هاتە کوشتن.

## گرنگترین کارێن عەبدولمەلیکی

١- ب عەرەبیکرنا دەزگەهێن دەولەتێ :-ئانکو گورینا هەموو تشتا ل دەولەتا وان بۆ زمانێ عەرەبی چونکی بەری زمانێ فارس ویونانی دهاتنە بکارئینان وگرنگترین گورین بابەتا ڤەدگریت:

أ-ب عەرەبیکرنا دیوانا:

عەبدولمەلکی فەرمان دا کو هەموو دامو دەزگەهێن دەولەتی ئانکو دیوانا بکەتە عەرەبی، زمانێ رۆمێ ل شامێ وفارسی ل عیراقێ گوری بۆ عەرەبی، بەلێ ل ولاتێ مسرێ ئەڤ کارە هاتە پاشئێخستن هەتا سەر دەمێ کورێ وی وەلیدی ٨٦-٩٦ کۆچی ، ژ ئەنجامێ ڤی کاری فەرمانبەرێن دیوانا نەچاربون خو فێری زمانێ عەرەبی بکەن دا کولسەر کارێن خوبمینن، زمانێ عەرەبی بوو زمانەکێ فەرمێ ئەڤەژی پێنگاڤەك بوو دا کو خەلکێ هەمی ولاتێن ئیسلامێ فێری زمانێ عەرەبی ببن .

ب-خەلیفە عەبدولمەلکی ل سالێن ٧٤و٧٥ ی کۆچی فەرمان دا هەموو پارێن دەولەتا ئیسلامی ب نەخش ونیگارێن عەرەبی وئیسلامی بهێنە نەخشاندن وب پارێن بەرێ رازی نەبوو وبو هەر کار بەدەستەك(عامل)ەکی هەبوو

دولاتێ ویدا پارەی دەربێخیت ب وی شێوێ دەولەتێ داناى کو دگوتێ (پارێ ئیسلامێ ) ودگۆتە جهێ دەرئێخستنا وی (دار السکه)ئانکو (خانییێ چێکرنا پارەی ).

## پرۆژێن ئاڤەدانکرنێ:

١-دروستکرنا مزگەفتا ئەقصا پاشەریف وقوبا سەخرا موشەرەف ل قودسێ.
ل سالا٦٦ێ کۆچی دەست ب دروستکرنا هەردو مزگەفتا کر ، وباجا زەڤیا پاحەفت سالا تەرخانکر بۆ دروستکرنا وان. ول سالا٧٢ێ کۆچی داوی ب دروستکرنا وان هات .

٢-رێکخستنا کارگێریا دەولەتێ :-

ئەو کارێن کومعاویەی دەسپێکرین عەبدولمەلکی تەمام کرن وەکی رێکخستنا دیوانا زەڤیا (الخراج)،پشتی هێمن بوونا بارودوخێ دەولەتێ دەست ب سەر ژمێریا (اهل الذمة)
جوهی ومەسیحیا کر، بو دانانا باجێ ل سەر وان .



## وەلید کورێ عەبدوالملك ( ٨٦-٩٦ )

وەلیدێ کورێ عەبدلمەلکی جێگرێ بابێ خوبوو، وپشتی وەغرکرنا وی جارەکا دی بو خەلیفە، و ماوێ ١٠ سالا ودەسهەلاتێدا ما ، ول سەردەمێ وی هێمنی وخۆشی وئەرزانی بوو، وەلید شیا گەلەك جها بگریت وبێخەتە بن دەسهەلاتا خو بتایبەتی ولاتێ السند و ولاتێ ماورا النهر (ل رۆژ هەلاتێ) وولاتێن رۆژ ئاڤایێ عەرەبی وئەندەلوسێ (ل رۆژ ئاڤای).

پەیدابوونا ڤی بارودۆخی بۆ هێزو وشیانێن بابێ وی ڤە دگەریت چونکی پشتی مرنا خو دەولەتەکا بەرفرەھ وهێمن بۆ بجھ هێلا.



## عومەرێ کورێ عەبدولعەزیزی ( ٩٩-١٠١ ) کۆچی )

عومەرێ کورێ عەبدولعەزیزی کورێ مەروان کورێ حەکەمێ ، ل سالا ٦٢ێ کۆچی ژدایك بوویە، لگەل بابێ خوبوو دەمێ ل مسرێ وال ولسەر داخازا وی کو داخاز ژ بابێ خو کر بهێتە هنارتن بۆ مەدینێ بو خاندنێ ورووینشتنێ لگەل زانا پیاوێن ئایینی، هەر ژ بچووکییێ قورئان ژبەرکر ،هندێ بێژی ل زانستی دا

شارەزا بوو، عومەرێ کورێ عەبدولعەزیزی خودان رەوشتەکێ بلند ودەست پاك وزمان پاقژ بوو خو مەزن نەدکر ویێ دفن بلند نەبوو، سالوخـەتێن وی وەکی یێـن عومەرێ کورێ خەتابی بوون.

## گرنگترین کارێن عومەرێ کورێ عەبدولعەزیزی:

١-باج لسەر وان کەسان نەهێلا ئەوێن بووینە موسلمان ژ (أهل الذمة) جوهی ومەسیحیا.

٢-ئێکەمین کەس بوویە تەماشەی سکالایێن غەدر لێ کریا کری و فەرمان دایە هەموو کاری پێ بکەن.

٣-فەرمان دایە کار بەدەستان د رێیا قورئانا پیرۆز وسونەتا پێغەمبەری دا کار بکەن .

٤-د سیاسەتێدا ئاشتی پیادەکریە ، لگەل خەوارجا دانوستاندن وروینشتن کریە وژمارەك هاتنە لگەل وی وژمارەکا دی چالاکیێن خو ل سەر دەمێ حوکمێ وی راوەستاندن.

٥-زەڤی چاککرن و بیر لێ کولان وریێ ژی چاککرن.

ل سالا ١٠١ ك خەلیفە عومەرێ کورێ عەبدولعەزیزی چوو بەر دلۆڤانیا خودێ.

## خەلیفە مەروان کورێ محەمەدی( ١٢٧-١٢٢ ):

مەرون کورێ محەمەدی ، ل کوردستانێ ژدایك بوویە وپەروەردە ببوویە، وهەر ب والیێ کوردستانێ وئەرمینیا هاتە دانان ، مەروان دژی خەلیفە ئیبراهیمێ کورێ وەلیدی راوەستا، وشیا هێرەشەکێ بینیتە سەر شامێ ولەشکەرێ خەلیفەی بشکێنیت وب سەرکەفتیانە راگەهاندنا دەولەتێ دا بەلێ ل سالا ١٣٢ێ کۆچی دەولەتا ئومەوی ژناڤچوو.

## راهێنان

ئێکەمین خەلیفێ ئومەویا خەلیفە [ ] بوو.

داوی خەلیفە: [ ]

تو ژی سالا دامەزراندنا ........وسالا ژناڤچوونا

ئومەویا ........... بنڤیسە .

## هۆکارێن ژناڤچونا دەولەتا ئومەوی:

ژناڤچوونا دەولەتا ئومەوی بۆ ڤان هوکارێن خارێ ڤەدگەریت:

هەر چەندە بیرو بۆچونێن جودا هەنە بۆ روهنکرنا ژناڤچوونا دەولەتا ئومەوی بەلێ ئەڤ هۆیە زۆر د دیار وبەرچاڤن.

١-زەفتکرنا دەسهەلاتێ ، چونکی مافێ وان نەبو وب زۆری دەست ب سەرداگرت.

٢-بکار ئینانا توندوتژییێ لگەل خەلکی .

٣-خەلکەکێ خراب وبێ مفا ل خو خیرڤە کر بوون .

٤-مال وسامانێ خەلکێ ب نەهەقی دخوار.

٥-گەلەك ژ والی وکار بەدەستێن وان د دلرەق وستەمکار بوون.

## دەولەتا عەباسی(١٣٢-٦٥٦)ك

### بنەمالا عەباسیا :

پشتی مرنا عەباسێ کورێ عەبدولموتەلیبی ،عەبدوللایێ کورێ وی کو ژ هەمیا ب ناڤ وناڤدارتر دگەل ئومەویا بناشتی دژیا، پشتی مرنا عەباسی عەلیێ کورێ وی ژلایێ ئومەویاڤە رەوانەی باژێرکێ (حميمة) دهێتە کرن هەتا سالا ١١٨ کۆچی ل وێرێ دمریت ، بەلێ عەلی کورێ وی کو ناڤێ وی عەبدوللاێیە ئێکەم کەس بوویە دڤێ بنە مالێدا کو ئارەزوویا خەلافەتێ هەی، دەمێ ئومەویا زانی کەلەك ب توندی دژایەتیا وی دکەن وئێشینن، پشتی هەوڵ وبزاڤەکا بێ راوستان ، عەباسی شیان نەیار ودوژمنێن ئومەوی ل بن دروشمێ (رازی بوون ژبنە مالا محمد(س.خ) (الرضا من ال محمد (ص) رێك بێخن ودەولەتەکێ دامەزرینن ب ناڤێ (عەباسێ کورێ عەبدو لموتەلیبی)کو مامێ پێغەمبەریە وژلایێ تەمەنی ڤە مەزنێ بنە مالێ بوو.

### ئارمانجا عەباسیا :

بانگەوازیا عەباسا بزاڤەکا سیاسی بوو، مەرەما وان یاسەرەکی:

١-نەهیلانا ئۆمەویا .

٢-نەهیلانا جوداهیێ دناڤبەرا عەرەب وپشتەڤانێن وان -موسلمانێن نە عەرەب .

٣-پەیرەوکرنا فەرمانێن قورئانێ وکردەوێن پێغەمبەر (س.خ) .

### دامزراندنا دەولەتا عەباسی:

کەلێن ئیرانێ تۆخمێ سەرەکی بوون ژ دامەزراندنا ئەڤێ دەولەتێ ،پرانیا تەخێن کو ل دویف ڤێ بانگەوازیێ هاتین تەخا هەزار

بندەست بون ، کو دئامادەبوون بۆ هەر کارەکێ ببیتە ئەگەرێ بدەست ڤە ئینانا هیڤی وئۆمێدێن وان .

## بانگەوازیا عەباسیا ( قۆناغا نهێنی ):

عەباسیا ب مەرەما بەلاڤکرنا بنگەوازیا خۆ ، ل گشت ولاتێن ئیسلامێ بانگەوازیا خۆ بەلاڤکر ، ب تایبەتی جهێن دوور ژلایێ روژ هەلاتیڤە ب شیوازێن جودا جودا ، هەبوون ب ناڤێ بازرگانێ ، ناڤێ سوفیاتیێ .......هتد. هەتا کو ئاشکرا نەبن وزەمینێ خوش بکەن ول سەر پێ خۆ راوەستن ژنوی ئاشکرا بکەن.

## رێکخەرێ بانگەوازیێ :

ئەڤ کارێ سیاسي ژلایێ (ئیبراهیمێ ئیمام) ڤە کو ئیمامێ مەزنێ وان بوو، دهاتە ئینان ل دەسپێکێ لپەی فەرمانێن ئیمامی، ب هەر شیوەکی روو بریدووبوون دگەل ئومەویا قەدەغەبوو، ژ ترسا ئاشکرا بوونێ ، هەر ژبەر ڤێ ئەگەرێ ژی ناڤەرۆکا ڤێ بانگەوازیێ یا دیار نە بوو.

## قۆناغا ئاشکرا :

گەلەك ب رێك وپێکی رەه وریشالێن بانگەوازیا خۆ دا هیلانە ناڤ خەلکی وژمارەکا زۆرا خەلکی ب دویڤ کەفتن ، رۆژ بۆ رۆژێ دبێشڤە چوون ێدا بوون ، ئەڤجا وەلێ هات کو ئاشکرا بکەن ، بەلێ بۆ دەست نیشانکرنا جهەکی بۆ کارکرنێ پشتی پێك گورینا بیرورا و دانوستاندنا باژێرێ (مەرو) ڤێ مەرەمێ هاتە دەست نیشانکرن بو ، ول رۆژا ئێکێ یاجەژنا قوربانی سالا۱۲۹ێ کۆچی ٧٤٦/ زایینی ، بانگەوازي هاتە راگەهاندن.

## ئەبوموسلمێ خوراسانی:

د قۆناغا نهێنیدا ،ئەبومسلمێ خۆراسانی  پەیوەندی ب (ئیبراهیمێ ئیمام)ڤە کر ژ بۆ کارکرنێ ، پشتی ماوەکی دیت کو ئەڤ لاوە خودان شیانێن زۆرە، کرە سەرپەرشتیارێ بانگەوازیا

خو ل خۆراسانێ ، ئیمامێ مەزن هند باوەری پێ هەبوو هەتا رادەکی نهێنیێن خو بوو وی ئاشکرا کربوون، زیرەکیا ئەبومسلمی وناڤ داریا وی ئومەوی بزداندبوون، ل هەرێما خۆراسانێ عەرەبێن وێ ژێك جودا کربوون ،پشتی ماوەکی شیا دەست ب سەر خۆراساندا بگریت وکار مەندێن ئومەویا دەربێخیت وکارگێریا ئەڤێ هەرێمێ کرەد دەستێ خودا .

## شەرێ زاب ل سالا ١٣٢ێ کۆچی:

پشتی ماوەکی ئومەوي ئیبراهیم ئیمامی دەستگیر دکەن ود زیندانیێدا د کوژن ، بەری مرنا خو ژی خەلافەت بو أبو العباسی برایێ خو راسپارد بوو کو ئەڤەژی سالا ١٣٢ خەلافەتا عەباسیا ل کوفە رادگەهینیت وخەلکێ کوفە ژی بەیعێ د دەنێ ، خەلیفە مەروان ب خۆ وب لەشکەرەکێ مەزنڤە ژ جەزیرێ هاتە مویسل ئەبو العباس ژی بۆ روو ب رووبوونا مەروانی لەشکەرەك ب سەرۆکاتیا مامێ خۆ (عەبدوللایێ کورێ عەلی) پێك ئینا هەردوو ل سەر زیێێ مەزن نزیك باژێرکێ خازر گەهشتنە ئێك شەر وپێکدا دانا دەسپێکر د ئەنجامدا ئومەویا شکەستن ئینا ، هەر چەندە ژمارا شەرکەرێن وان دگەهشتە دەهان هزار کەسا ، نەچاربوون خۆ ڤەکێشن بو باژێرێ مویسل ، بەلێ خەلکێ مویسل نەهێلا بچنە ناڤ باژێری ودەرگەه لێ نقەنەکرن ، نەچاربوون بەرەف ولاتێ شامێ بچن ، عەباسیا راهێلاب دویڤ ڤە ، مەروانی ل چ جها خونەگرت هەتا گەهشتیە ولاتێ مسرێ ، پشتێ هنگێ شیا خۆ بگەهینتە گوندێ(بوصیر) وعەباسیا دەست ژێ بەرنەدا هەتا ل گوندی کوشتی . ب کوشتنا (مەروانی کورێ محەمەدی) دەولەتا ئومەوی ب داوی هات .

ئەڤ چەرخە ژ دەست ب كاربوونا خەلیفە ئەبولعەباس سفاح دەسپێدكەت هەتا كوشتنا خەلیفە ئەلموتەوەكل ل سالا۲٤۷ێ كوچی دڤی ماوەیدا عەباسیا گشت هەول وبزاڤێن خۆ بكارئینان بۆ چەسپاندنا دەسهەلاتا خۆ .

دەولەتا عەباسی ل سەر بنەمایەكێ ئایینی هاتیە دامەزراندن ، كاریگەرترین چەك بوو ب كار ئینای بۆ ژناڤ برنا دەولەتا ئومەوی هەتا ڤەگەراندنا دەسەلاتێ بۆ بنەمالا پێغەمبەری (س.خ): بڤی جۆری ڤی دروشمی خەلكەكێ ئێكچار مەزن لێ كوب خرڤەكربوو . ب تایبەتی خەلكێ هەژار وسادە ،عەباسیا گەلەك ب زیرەكی مەلبەندێن خۆ دەستنیشان كربوون ، ب تایبەتی كوفە وخۆراسان كو خەلك دێ پشتەڤانێ وان بیت ، پرانیا وان ساسانی بوون ،چونكی بنەمالا پێغەمبەری خۆش دڤیا،ساسانی خودان مێژوو وكەلتورەكێ رەسەنن ، كو دەسەلاتا خۆ ب سەرعەرەبا دا گرتبوو ل عیراقێ ویەمەنی ،بەلێ ب هاتنا ئایینێ ئیسلامێ دەسهەلاتا وان نەما ،ئەڤ بانگەوازیە ب دەلیڤە زانی كو جارەكا دی ڤەگەرنەڤە، بۆ ب دەست ڤە ئینان ئارمانجێن خۆ.ڤێجا هەر دڤێ قۆناغێدا ، عەباسیا ئەوێ گومان ل ژێ كریا ،ژناڤ دبر ولپەی رێنماییێن وان كو ب ئەبو موسلمێ خۆراساني راسپاردبوو ورێ دابوویێ هەر كەسێ گومانێ ژی بكەت بكوژیت،و كەلەك كەس ژی كوشتن، وهەر ئەوبخو ژی بوو دبیتە قوربانێ گومان لێكرنێ دهێتە كوشتن.

پشتی مرنا (ئەبولعەباس) ل سالا۱۳٦كۆچی ، خەلیفە ئەبو جەعفەر ئەلمەنسورجهێ وی گرت ،ئەلمەنسوري بەردەوام خەبات دكر بۆ چەسپاندنا دەسهەلاتا دەولەتا عەباسي،پتر ب ئاڤاكرنا باژێرێ (بەغدا) ناڤ ودەنگیا وی دەر كەفت بوو .

## سەردەمێ دووێ یێ عەباسیا

## چەرخێ دەسهەلاتا تورکی( ٢٤٧-٣٣٤ )کۆچی

ئەڤ سەردەمە ژ دەست ب کاربورنا خەلیفە مونتەسر دەسپێدکەت ل سالا ٢٤٧ کۆچی/ ٨٦١ زایینی دڤی سەردەمیدا دەست تێوەردانا تورکا دناڤ کاروبارێن دەولەتێ دا ب دانان لادانا خەلیفا دەسپێکر بۆ وێ مەرەمێ تورکا خەلیفە دکوشتن و چاڤێن وان دئینانە دەرێ .

جارێن وەسا هەبووینە خەلیفە نەچارکرینە هەتا ب دەستێ خۆ لادانایێ بنڤیسیت چ بۆ خۆ وچ بۆ ئێکێ دیتر ، ژبلی ڤی حالەتی د ناڤ تورکا ب خۆ ژیدا هەڤرکی هەبوو ڤی کاری ئەمن وئاسایشا ولاتی تێکدابوو مونتەسر ژ شەش هەیڤا پتر نەشیا خەلافەتێ بکەت ، و دبارودۆخەکێ نەدیار دا مر، سەرکردێن تورکا دەست مرنا ویدا هەبوویە.

تورك خودان دەسهەلاتا راستەقینەبوون، وەسا رێکەفتن کو رێن (موتەوەکل )ی نەکنە خەلیفە .بەلکی خیلافەت ژکورێن موعتەسەمی دەرنەکەڤیت .

پشتی هاتنا موستەعین (٢٤٨-٢٥٢ێ کۆچی) بارودۆخ جیگیر نە بوو ، بێزار بوو سامرا بجە هێلا ، هاتە بەغدا وژمارەکا تورك وکار بەدەستاد گەل دابوو بەلێ چ بدەستێ خەلیفەی نەبوو. دەمێ تورکا دیتی کو خەلیفەی سامرا ب جە هێلایە ، هەست کر کو جهێ وان دمەترسیێایە بزاڤ کر رازی بکەن کوڤەگەریتە ڤە بەلێ نەزڤری، تورکا موعیزێ کورێ مامێ وی ل جهێ وی دانا ، بڤی جۆری موستەعین ل بەغدا وموعیز ل سامرا دئەنجامدا شەر دناڤبەرا وان پەیدابوو وهەر دو بازێر هاتنە دۆر پێچکرن ژبەر کو ژمارا ئاکنجیێن بەغدا گەلەك بوون بەگریا دور پێچکرنێ نەبوو ،ب باشی زانی ڤێ کێشێ چارەسەربکەن وموستەعین نەچار کر بەغدا ب جە بهێلیت وبچیتە بازێرێ مەککەها پیرۆز .

## سەردەمێ سێێ یێ عەباسیا

## چەرخێ دەسهەلاتا بوەیهیا (٣٣٤-٤٤٧کۆچی /٩٤٥-١٠٥٥زاینی)

بوەیهی خەلکێ دەیلەم بورن – ولاتەکە دکەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ دەریا یاقەزوین – ل دەسپێکا بەلاڤبوونا ئایینێ ئیسلامێ ، بوەیهی ژبەر چیایا یا ولاتێ خو نەبوونە موسلمان.

عەباسی شیان ڤێ هەرێمێ ب ولاتێ ئیسلامێ ڤە گرێدەن ، ب تایبەتی ل سەر دەمێ ئەبو جەعفەرێ مەنسور (١٣٦-١٥٨کۆچی) ول سەر دەمێ هارون رەشیدی (١٧٠-١٩٣ کۆچی)ئەڤ ولاتە بوویە مەلبەندێ یەحیایێ کورێ عەبدوللاێ عەلەوی ، شیا خەلکەکێ زۆر ل دۆر خۆ خرڤەکەت ومەترسی بۆ هارون رەشیدی پەیدا کر ، ترسیا نە کو جودا ببیت ، ڤێجا بریاردا پێکاهاتن دگەل یەحیای بمینیت بەلێ ل بن ئالایێ عەباسیا .

بەلاڤبوونا ئایینێ ئیسلامێ ل ڤێ هەرێمێ ڤەدگەرێتە ڤە بۆ سالا( ٢٥٠کوچی – ٨٦٤ زایینی ) حەسەنێ کورێ عەلی چوو ولاتێ دەیلەمێ ،سێزدە سالا ل وێرێ ما شیا بیروباوەرێن خو هەتا رادەکی بەلاڤ بکەت وپشتی مرنا وی رەوشا ولاتی تێکچوو وهەڤرکی وململانێ یادناڤبەرا سەرکردا دا بۆ ئەگەرا پەیدا بوونا بوەیهیا.

## دەسپێکا پەیوەندیین بوەیهی وعەباسیا:

ل سەردەمێ خەلیفە ئەلرازی بیللاه(٣٢٢-٣٢٩کۆچی) سەرکردێ بوەیهی (عەلیێ کورێ بوەییە ) پەیوەندی لگەل عەباسیا کربوو،بۆ داکو دان پێدانێ ب پەیوەندیێن وان بکەن بەرامبەر پارەکێ زۆر ژبەر نەبوونێ وهەژاریا عەباسیا رازي بوون ،پشتی ماوەکی بوەیهی ژوێ پارەدانێ پەشیمانبوون ، بەلێ ئارمانجا خۆ ب دەست ڤە ئینا وشەرعیەتا خو وەرگرت، بوەیهیا ب زیرەکی کارێ خو ب جه ئینا .

بوەیهی دئاگەهداربوون کو سیاسەتا خەلیفەئەلرازی (٣٢٢-٣٢٩کۆچی) بۆ چارەسەرکرنا ئەڤان کێشا پێ ناهێتەکرن ، بوەیهیا رێ خۆشکر بۆ داگیرکرنا عیراقێ . بۆ تاقیکرنا کو هیزا دەولەتا عەباسی چەند جارەکا هێرش ئینانە سەر چەند دەڤەرەکا بەلێ عەباسیا نەهیلا.

## گرتنا بەغدا :

ل سەر دەمێ خەلیفە موتیعی (٣٣٤-٣٦٣ کۆچی) بوەیهیا ب سەرۆکاتیا (ئەحمەدێ کورێ بویە) یێ ناڤدار ب (معز الدولة) هاتنە ناڤ بەغدا، وەکی هەر داگیر کەرەکی بویهیا ب پلا ئێکێ بەرژەوەندیێن خو بەرچاڤ دکرن ، بۆ بریڤەبرنا کاروبارێن عیراقێ پرانیا وەزیرو کار بەدەستێن وان فارس بوون .خەلکێ بەغدا بێزاری ونەرازیبوونا خۆ دەربری.

## سەر دەمێ چارێ یێ عەباسی

## چەرخێ دەسهەلاتا سەلجوقیا ( ٤٤٧-٥٧٠ك )

سەلجوقی کۆمەکا هۆزێن تورکانە ، ژ دەشتێن تورکستانێ هاتبون ، وناڤی وان ژ سەر کردێ وان یێ ناڤدار سەلجوقێ کورێ دقاق هاتیە .

سەلجوقی نە شیان ل وەلاتێ خو جێگیربن ، بەرەف ولاتێ موسلمانا ل رۆژئاڤای هاتن ،ل سالا٣٤٥کۆچی/ ٩٥٦ زایینی دەسهەلاتا وان دەسپێکر .

سەلجوقی پشتی سەر هاتیەکا دورر ودرێژ ژ جهەکێ بۆ جهەکێ وقوناغ بۆ قوناغێ هاتن هەتا گەهشتینە نزیك عێراقێ ل سالا٤٤٧کوچی/ ١٠٥٥ زایینی ، توغرل بەکێ سەرۆکێ وان مەکێ بۆ خیلافەتا عەباسی دنڤیسیت ئەو بەرێ پشتەڤانی وچەماندنا خو نیشا نددەت، وپەیمانێ ددەتە تورکێن بوەیهیی کو پێدڤیە هاریکارێن هەڤروبن ، بڤێ دبلوماسیەتێ بوەیهیی وعەبسی کرنە دۆستێن خو، د دەمەکیدا عیراقیا گازندە ژ دەسهەلاتا بوەیهیا دکرن ژبلی کێشێن دناڤبەرا واندا ، ئەڤە هەمی د بەرژەوەندیا سەلجوقیا دا بوو ، وئێکەم پێنگاڤا سەلجوقیا مفا وەرگرتن بوو ژ تورکێن بوەیهیی،بۆ زەمینە خۆشکرنێ ورێ خۆشکرن بۆ داگیرنا عیراقێ .

سەلجوقی دئامادە باشیێ دا بوون بۆ داگیرکرنا بەغدا ، سەر کردەکێ تورك (بەساسیری) دەست بسەر کاروبارێن بەغدا دا گرتبوو ، وچ پەیوەندی دناڤبەرا خیلافەتێ وبوەیهیا وبەساسیری دا نەمابوو . ل سالا ٤٤٧ کوچی / ١٠٥٥ زایینی توغرول بەگ بەرەف عێراقێ کەفتە رێ ،ل باژێرێ حەلوان هاتەناڤ ئاخا عیراقێ ، کو کورتترین وسەناهیترین رێیە بۆ کو هاتنا ناڤ بەغدا

داكو هاتنا وى يا سروشتى بيت ،ولايەنگەرێن بەرنگارى وى نەبن ، نامەك بۆ(ديوانا خيلافەتێ) دهنێريت ، تێدا خەلكى پشت راست دكەت كو هاتنا وى بۆ بەغدا بتنێ دێ قۆناغەك بيت بۆچوونا حەجێ ئنيەتا وى ئەوە رێكا حەجێ چێبكەت وئاڤەدان بكەت ،پاشى دێ بزاڤێ كەت دەسهەلاتا فاتميا دڤێ دەڤەرێدا نەهێليت .

ئەڤێ نامێ خەلك پشت راستكر ، ترس نەما ، وخيلافەتا عەباسيا خاپاند خەليفە ئەلقائم بئەمريللا بريا ردا ناڤێ سولتا نێ سەلجوقي دگۆتارا نڤێژا هەينێدا بينيت . وتوغرل بەگى ب فەرمى دەستويرى وەرگرت كو بێتە بەغدا ب پێشوازيەكا گەرم بخێرهاتن لێ هاتە كرن ول ٢٥ێ هەيڤا رەمەزانێ سالا ٤٤٧ كۆچى/ ١٠٥٥ زايينى سەلجوقى ب رێ و رەسمەكێ رێك وپێك هاتنە ناڤ بەغدا .

## جەرخى عەباسيايێ داويێ

پشتى مرنا سولتان سنجر خودان دەسهەلاتا سەلجوقيا ل ٥٥٢ كۆچى/ ١١٧٥ زايينى سولتانێ بهێزێ سەلجوقيايێ داويێ، بێ هێزى ولاوازى كەتە ناڤ وان ، بتايبەتى ل سالا٥٦٠-٥٧٠ كۆچى وەلێ هاتن سولتانێ سەلجوقيا كرە يارىەك (العوبة) د دەستێ خودا .

### الناسر لدينللا:

دڤى سەردەميدا خورازم نزيكى عيراقێ ببوون ، خەليفە ناسر داخازا هاريكاريێ ژێكر بۆ دانانا سنۆرەكى بۆ سەلجوقيا، ول دەمێ بەشداريكرنا لەشكەرى خوارزمى بتنێ بوون بيێ كو لەشكەرێ خەليفەى هاريكاريا وان بكەت .

**المعتصم بالله :**

پشتی موستەنسەری سالا ٦٤٠ك/١٢٤٢ ز کورێ وی بناڤێ المعتصم بالله جهێ وی گرت ،زەلامەکێ نەرم وسەرخوبوویە بەلێ دحوکمدانییێدا شارەزاییا وی یا کێم هەبوو ، لەورا لاواز بوو ، نەشیا بەرهەنگاریا وان کەسا بێن دلێ خو دبرە خیلافەتێ، ڤێجا هەر چەندە خەلیفەیێ ئاگەداری بو ژمەغولیا بو کو دلێ خو بریە خەلافەتێ ، بەلێ ئەڤە ب چ ڤە وەرنەگرت ، بڤێ چەندێ خیلافەتێ ل سەر دەمێ ڤی خەلیفەی تووشی داگیرکرنا مەغولیا بوو ، وب دەستێ مەغولیا هاتە کوشتن بەغدا ل سالا٦٥٦کۆچی /١٢٥٨ زایینی کەفتە دەستێن وان .

## بەرسڤا ڤان پرسیارا بدە

١-عەبدولمەلیکێ کورێ مەروانی ب چییێ ناڤدار بوو؟

٢-باسێ گرنگترین کارێن ئەبو جەعفرێ مەنصور بکە.

٣-بوەیهیی ژکیڤە هاتبوون .

٤-بویهیی چاوا شیا نخو بگەهننە بەغدا ؟

٥-سەلجوقیا ل سالا......هەتا ......حوکمێ ل عیراقێ کری .

## بپرسیار

ڤان ڤالاهیا پڕبکە :

١-ناڤدارترین خەلیفێ ئومەوی.......بوو.

٢-دەولەتا ئومەوی ل سالا....... تا سالا.......حوکم کر .

٣-ل سالا....... حوسێنێ کورێ ئیمامێ عەلی هاتە کوشتن .

٤-ل سەر دەمێ عەبدولمەلیکێ کوڕێ مەروانی دیوان کرنە ب زمانێ .......،

٥-ئەو پارێ کو عەبدولمەلیکی دروست کری ، دگۆتنێ پارێ .........،

٦-مزگەفتا قبە الصخرە ل......... هاتە دروست کرن.

٧- ........سەرکردێ گرتنا قودسێ بوو .

٨- ........ئێکەمێن خەلیفێ ئومەوی بو بەرێ خو دا گازندێن خەلکی

٩-خەلیفە مەروانێ کوڕێ محەمەدی ل ....... ژدایک بوو.

١٠-دەولەتا عەباسی ل سالا .......... هەتا سالا......... بەر دەوام بوو .

# هەڤولاتیبوون

د سەرانسەری جیهانێدا ئێك ژ هۆكارێن سەركەفتنا پرۆسا دیمۆكراسی وبەختەوەریا گەلان وەرارا دام و دەزگەهـ و ێكخراوێن مەدنیە ، ئەڤ وەرارە ب ئەگەرا بزاڤكرنێ یە ژبۆ بدەسڤەئینانا خاسیەتێن هەڤولاتیبوونێ ، دبیت ئەڤ چەند خالە وەكی رەوشتێ تاكی بن بۆ هەڤولاتیبوونێ :-

## ١- راسگۆیی و دلسۆزی دكاركرنێدا :

راستگۆیی و دلسۆزی رەوشتێ تاكیە ژبۆ هەڤولاتیبوونێ ، ئانكو هەبوونا ڤان خاسیەتا شیانێن هەڤولاتی دچڤاكیدا ئەكتیڤتر لێدكەت ومەودایەكێ فرەهتر بۆ پەیدا دكەت.

## ٢- گیانێ لێبورینێ :

ددەمێ شەریدا هزرێ دئاشتییێدا دكەین و ددەمێ ئاشتییێدا هزرێ دداهینانێدا دكەین ، پێدڤیە هەمی كەسا گیانێ لێبورینێ هەبیت داكو ب ئاشتی بژین، د هەڤدو گەهشتن و هەڤدو قەبوولكرن مە فێری وێ چەندێ دكەت چاوا بەرەڤ دیمۆكراسیێ بچین و بیرو بۆچوونێن جودا قەبوولكەین وهیڤی و دیالۆگ ببیتە زمانێ هەڤچەرخ.

### ٢- ئێکگرتن و هەڤکاری:

ئانكو ئێکگرتن لسەر بنەمایێ دهەڤدو گەهشتن و هیڤیا ولاتینیێ و گیانێ هەڤکاریکرنێ دگەل هەڤدو.

**راهێنان**

کەنگی ئەز هەست ب بەرپرسیاریێ دکەم

-کەنگی من ئەرکێن خوە بجهئینان

هنگێ ئەز هەست ب بەرپرسیاریێ دکەم

- ئەگەر من مافێن بەرامبەری خوە پارستن هنگێ

ئەز هەست ب بەرپرسیاریێ دکەم

- ئەگە من ئەرك و مافێن خوە ژێکجودا نەکرن

ئەرێ ئەز هەڤولاتیەکێ باشم؟

ئەگەر بەرسڤ : نەخێر بوو

بۆچی؟

## ٤- هەست كرن ب بەرپرسياريێ:

ئەم هەمی وەكی تاكەكێ ڤی جڤاكی ئەركەكێ لسەر ملێن مە ئەو ژێ بەرپرسياريە بەرمبەر مە بخو و پاراستنا دەستكەفتێن مرۆڤايەتيێ و بهێزكرنا هەستەوەرا دگەل ژينگەهێ و هەست كرن ب بەرپرسياريێ بەرامبەر جڤاكی و رێزگرتنا بەرامبەر و پاراستنا دام و دزگەهێن مەدنی و نيشتمانی نە.




## ٥- رێزگرتن ل ياسايێ:

ئەگەر جڤاكێ هشياربيت ، دڤێت رێيەكێ دانيت بۆ برێڤەچوونا بەرنامێ كاری دناڤبەرا تاكێن جڤاكيدا،دڤێت ياسايێ دانيت و دروشمێ سەرەكيێ وێ ياسايێ ئەوە كو ئەم هەمی ل بەرامبەر ياسايێ وەكهەڤين ژ بەر هندێ لسەر مە هەميان پێويستە دهەمی بياڤێن ژيانێدا رێزێ ل ياسايێ بگرين .

### ٦- رێزگرتن ل دەمی:

دەم پڕبهایە و نابیت بهێتەژدەست دان، رێزگرتنا دەمی داهێنانێ دروست دکەت، ب رێیا دلسۆزیێ دکارکرنێدا چڤاك بەرەڤ پێش دچیت.

### ٧- بەرقەراکرنا ئاشتیێ و بهەڤرا ژیانێ:

ئانکو قەبوولکرنا هزروبیرێن جودا و باوەریکرن ب هەڤدو و ژخوە رازیبوون.

**چالاکی /**
گرۆپەك ژ قوتابیان دێ راپۆرتەکێ دەربارەی بهایێ دەمی بەرهەڤکەن

### ٨- پارستنا تایبەتمەندیێ:

مە هەمیا جۆرەکێ تایبەتمەندیێ هەیە کو بەشەکە ژ کەساتیا تاکی ،لێ کەساتیا سەرکەفتی تایبەتمەندیێ د پارێزیت ئەڤە ژی رێزگرتنە ل هەڤدو و قەبوولکرنا نهێنیێن هەڤولاتیبوون ئانکو گورینا رەوشتی و هەستکرن ب هەستێ بەرامبەر و پاراستن و بهێزکرنا دام و دەزگەهێن مەدەنی و پێشڤەبرنا پرۆسا دیمۆکراسی و مەدەنی ب رێیا هوشیاربوونێ .

**راهێنان**
وەکهەڤی: دڤێت ئەم هەمی بەرامبەر یاسایێ وەکهەڤ بین ئانکو یاسا جوداهیێ دناڤبەرا دەولەمەند و هەژاراندا ناکەت ...
جوداهیێ دناڤبەرا بەرپرسەکی و ولاتیەکێ ئاساییدا ناکەت..
لێ : ئەرێ یاسا جوداهیێ دناڤبەرا ( بێ گونەهـ ) و( گونەهبار)یدا دکەت ؟
بۆچی ؟

بەنـــدێ دووێ

# جڤاك و سروشتێ پێكهاتا وی

## ١- جڤاك چیە؟

مرۆڤ بوونەوەرەكێ جڤاكیە نەشێت بتنێ بژیت ، پێویستی ب كەسێن دیتر هەیە بۆ پێكگورینا سۆز و ڤیانێ وهەڤكاری و هاریكاریا هەڤدو و بهەڤرا ژیانێ و كریار و غەریزا بهەڤرا ژیانی دتاكیدا دبێژنێ بجڤاكبوون ئانكو بهەڤرا ژیانا بكۆم ، ئەڤەژی غەریزەكە دمرۆڤیدا و وەكی رەوشتێ وی لێهاتیە و بچووكترین غەریزا بجڤاكبوونێ لنك مرۆڤی و ئاژەلی حەزا چێكرنا خێزانێ یە ئانكو خرڤەبوون دچارچووڤەكیدا كو سۆز و ڤیان و رێز و هەڤكاری وان خرڤەدكەت كو رەوشت دناڤبەرا واندا دهاوبەشن ئەڤێ ژی دبێژنێ خێزان، خێزان ژی بچووكترین یەكا جڤاكی یە ، جڤاك ژی ژ چەند خێزانێن جودا جودا پێكدهێت كو چەند فاكتەرێن هاوبەش دناڤبەرا واندا هەنە وەك (ئاخ ، زمان ، مێژوو ، تیتال ، رەوشت و خاسیەتێن وەكهەڤ ، پەروەردە و ...... ) ئانكو خێزان ژینگەها جڤاكیا ئێكێ یە مرۆڤ تێدا هاتیە دورپێچكرن و تێدا رەفتارێ دكەت وئەڤە رێخۆشكرنە كو پەیوەندیێن جڤاكی دناڤبەرا ئەندامێن خێزانێدا دروست ببن.

ئانكو جڤاك (خرڤەبوونا خوجهایە) كو باوەری ب ئێك هیڤی و ئارمانجا پیرۆز هەیە، مفایێ هاوبەش و پەیوەندیێن رێك و پێك ئەو خرڤەكرینە، د ژیانێ و هزركرنێ و ماددەیدا دتانا هەڤدو دچن، هەروەسا ئێك ژ نیشانێن جڤاكی ئەوە كو هەردەم دگورینێدایە.

**چالاكی:**

جڤاك (خرڤەبوونا خوجهایە) لێ دڤێت باوەری ب ..................... هەبیت

## بنەمایێن جڤاكی

### ١- ئەرد :

ئەرد ئەو رووبەرێ ئاخێ یە كو پێكهاتێن سروشتی بخوڤەدگریت و هۆكارێن ژیانێ بۆ مرۆڤی بەردەست دكەت و چەند كەسەك ب شێوێ خێزانێ و گرۆپێن بچووك كو بەرژەوەندیێن وان وان بهەڤراكۆم دكەن و لسەر ڤێ ئاخێ دژین و بۆ بەردەوامیا ژیانی بكاردئینن و مفای ژێ وەردگرن ،ب درێژیا مێژوویێ ئەڤ پێككگورینە دێ یا بەردەوام بیت دناڤبەرا تاكا و بكارئینەرێن ئەردی ژبەر هندێ ڤێ ئاخی دپارێزیت و قوربانیێ بۆ ددەت چونكە پەیوەندیەكا گیانی ( روحی) دناڤبەرا مرۆڤی و ئەردیدا هەیە.

### ٢- شارستانیەت:

ئێك ژ بنەمایێن سەرەكیێن هەر جڤاكەكی ئەوە كو شارستانیەتیا تایبەتیا خوە هەبیت و شارستانیەت ژ ئەنجامێ هەڤركیا پێشكەفتنێ پەیدادبیت كو ئەو جڤاك ژ ئەنجامێ داهێنان و دروستكرنا مێژوویەكێ بۆ خوە تۆماردكەن كو بەردەوام شانازیێ پێ دكەن و دبیتە دەسكەفتەكێ نەتەوایەتی كو د بێژنێ شارستانیەت .

### ٣- مفایێ هاوبەش:

تەڤ ئەوێن دجڤاکیدا دژین پێککگورینا سۆزێ و هەڤکاریێ وهاریکاریا هەڤدو و بەرژەوەندی وان بهەڤراگرێددەن کو نەشێن بتنێ بژین ژبەر هندێ مفایێ هاوبەش مەزنترین گرێ بەندا جڤاکیە.

### ٤- پەیوەندیین جڤاکی:

جڤاکناس ، پەیوەندیێن جڤاکی ب بناغێ سەرەکیێ جڤاکی ددانن یان جڤاك کورتیا وان پەیوەندیێن جڤاکیە یێن جڤاکی و تاکێن جڤاکی بهەڤراگرێددەن ، ژ بەر هندێ هەردەم بزاڤێ دکەن سیستەمەکی پێکبینن کو ئارستەکرن و راگرتنا رەفتارێن وان رێکبێخیت ، ئەرکێ ڤی سیستەمی ئەوە رێ بدەتە چالاکیا و دەمان دەمدا ژی سنۆری بۆ دانیت ، چونکی ئەو سیستەم ئەوان دەستنیشان دکەت یێن پێدڤیە بهێنە کرن یێن نەهێنە کرن درێیا پەیوەندیێن جڤاکیدا.

**چالاکی:**

ژ نموونێن پەیوەندیێن جڤاکی ، پەیوەندی دناڤبەرا

| زارۆك و دایك و باب | برا و ............ | قوتابی و ............ | ولاتی و ............ |
|---|---|---|---|

### ٥- هاریکاری و هەڤکاری:

ئەڤە بناغێ بهەڤرا ژیانا بەردەوامە دناڤ جڤاکدا کومە هەمیا پێویستی ب هەڤدو هەیە ، کەس ژمە نەشێت بتنێ بژیت ژبۆ موکمکرنا فاکتەرێن بجڤاکبوونا تاکی دڤێت ئەم هەمی هاریکاری وهەڤکاریا هەڤدو بکەین.



### ٦- نووخوازی:

بنەمایێ شارستانیەتێ ونەڤەقەتیانێ یە ژ کاروانێ پێشکەفتنا جڤاکێن دیترێن جیهانێ ، دڤێت دژی راوەستیان و کەڤنەخوازیێ راوەستین ئەڤە ژی دێ ب رێیا پێشکەفتنا دام و دەزگەهێن مەدەنی دبیت دجڤاکیدا.

ژ نمونێن (( دام دەزگەهێن مەدەنی ))

| رێکخراوا | سەندیکا | سەنتەرێ |
|---|---|---|
| قوتابیان | ........... | مافێ...... |

## چالاکی

### لێبۆرین

ئەگەر برادەرێ تە بەرامبەر تە رەفتارەکا شاش کر ،

تو دێ چ کەی ..

((دێ ژێ سل بی , دێ نەخوٚش بەرسڤا وی دەی ,

دێ لێبۆری ؟))

## وەرارکرنا جڤاکی

دیرۆکنڤیس د وێ باوەریێ دانە کو خێزان د دەسپێکا دروستبوونا خوەدا ب ڤی شێوەیێ هەی نەبوویە ، ژبەرکو هۆکارێ سەرەکیێ ئاڤاکرنا خێزانی ئابووری و بەرژەوەندیا بهەڤرازیانێ بوویە ، تاك نەشیایە بتنێ دشکەفتاندا بژیت و هەبوونا خوە ژ کارەسات و ئافاتێن سروشتی و زیانداریێن درندە بپارێزیت ، لەورا وەك گرۆپێن بچووك ب شێوێ خێزانێ ژیایە و مروڤی پێویستی ب ئێکی هەبوویە کو هاریکاریا وی بکەت ژبۆ مسۆگەرکرنا خۆراکی و پێدڤیێن وی ، لەورا ژی ملکداری د تاکیدا پەیدابوویە لسەر شێوێ ژن ئینانێ . لێ لسەر یاسا و مەرج و تیتالێن نهۆ نەبوویە، ژنکێ پێگەه وبهایەکێ بلند د خێزانێدا هەبوویە ، چونکە پەروەردەکرنا زارۆکان و برێڤەبرنا تەڤ کاروبارێن ناڤ مالێ لسەر ملێن وێ بوون ، هەرچەندە مسۆگەرکرنا خوراکی و ژینگەها ئارام و پارستنا ژن و زارۆکان ژ درندان و کارەساتێن سروشتی لسەر ملێن زەلامی بوون ، لگەل هندێ ژی خرڤەکرنا خوراکی ودروستکرنا ناڤمالیێ و جلکا لسەر ملێن ژنکێ بوون. دجڤاکێ دەسپێکیدا زەلامی هند پێویستی ب ژنێ هەبوویە کو پالدایە پتر ژ ژنەکێ بینیت ، دا گەلەك زارۆك هەبن و بۆ ژیارێ مفای ژێ وەرگریت. ژ ئەنجامێ ئالۆزیا ژیانێ و زۆربوونا هەمەجۆریا پێدڤیێن ژیانێ خیزان نەچاربوون هەڤبگرن و جڤاکەکێ بچووکێ سادە پێکبینن ، ئەڤ جڤاکێن بچووك و سادە هێدی هێدی ب ئەگەرا زۆربوونا کەسێن دناڤدا، ب هەڤگرتنا چەند گرۆپەکێن بچووك جڤاکەکێ ب وەرارتر و پێشکەفتیتر و مەزنتر پێکئینا ،ب ئەگەرا زۆربوونا پێدڤیێن ژیانێ و زێدەبوونا داخوازێن تاکی ژیار پتر ئالۆزبو ئەڤە ژی گەشەکرنەکا دیتربوو کو جڤاکێ دەسپێکی ژ شکەفتا دەرکەڤن و ل کەنارێن

دەریایا و رووبارا و ئەردێن بەرفرەهێن چاندنێ خوجە بین، جڤاك ب ڤێ ژی تێر نەبوو چونكی بكارئینانا چاندنێ هەمی پێدڤیێن وی بجە نەئینایینە، ژبەرهندی بزاڤ كر ئامیرا چێكەت بۆ زۆركرنا درامەتێ چاندنێ و مسۆگەركرنا پێدڤیێن ژیارا رۆژانە ، بۆ پارستنا بەرژەوەندیان و دابەشكرنا ملكداریا درامەتێ رۆژانە بۆ ئەگەرا پەیدابوونا سیستەمێ حوكمداری و ئاینی و كاروبارێن ئابووری و پەروەردێ و سیستەمێ خێزانێ وجڤاكی و یاسایێ .... دئەنجامدا هەر گرۆپەك بۆ خودانا ئاخ و قەوارەكێ سەربخوە و شارستانیەتەكا تایبەتا جودا ژ جڤاكێن دیتر ، ب ڤێ رەنگێ جیهان بسەر چەندین جڤاكێن جودا جودا دابەشبوو. كو ب دەولەت هاتنە ناڤكرن . ئەو جڤاكێن نهۆ هەین پشتی د زۆر قۆناغێن پێشكەفتن و وەرارێدا دەربازبووین گەهشتینە ڤێ قۆناغا نهۆ تێدا.

**چالاكی: ژن نیڤا جڤاكیە**

دڤی سەردەمیدا ژنان ماف هەیە پشكداریێ د هەمی چالاكێن گەشەپێدانا جڤاكیدا بكەن ، ژ وان ژی چالاكێن سیاسی ..

ل پەرلەمانێ نهۆیێ ئیراقێ .... رێژا ژنان چەندە؟

ل پەرلەمانێ كوردستانی رێژا وان چەندە؟

# قوناغێن وەرارکرنا جڤاکی

## ١ - قۆناغا نێچیرڤانیێ

ئەڤ قۆناغە ب ئێکەمین قۆناغا بەرهەمئینانا تاکی دهێتە دهێتەهژمارتن و ئێکەمین قۆناغا کارێ سەربەستە کو هێزا کارێ وی بۆ وی بخود زڤریتەڤە،ئەڤە نیشانەکا گرنگا ڤێ قۆناغی بوویە . هەروەسا نیشانەکا دیترا ڤێ قۆناغێ ئەو بوو کو مرۆڤ ل یەك جە ئاکنجی نەدبوو ، ژبەرکو بدویڤگەریانا ئاژەلان ب مەرەما نێچیرکرنێ وەل مرۆڤی کربوو کو نەشێت ل یەك جە بمینیت ،ل هەرجهەکێ کو ژێدەرێ ژین و ژیارا وی نەدما دا ژوی جهی ڤەگوهێزیتە جهەکێ دیتر.



### ٢ - توناغا خودانكرنا ئاژەلی:

ب شێوەکێ گشتی گرۆپێن ئاژەل خودانكرنی ژ گرۆپێن نێچیرێ مەزنتر بوون ئەگەرا ڤێ چەندی ئەو بوو کو مرۆڤ شیا هۆیێن ژیارێ ڤەبینیت و دەستێ خوە دانیتە سەر، ژیانا گرۆپان دڤێ قۆناغێدا بنەجهتر بوو، چونکە پەیوەندی دناڤبەرا جڤاکاندا پەیدابوون . هەروەسا نیشانەکا دیترا ڤێ قۆناغی دروستبوونا هەڤرکیێ بوو دناڤبەرا جڤاکاندا لسەر دەست بسەرداگرتنا چەروانگەها و نیشانەکادیترا ڤێ قۆناغێ دروستکرنا خانیا بوو ، دگەل هندێ هیشتا هندەك جڤاك هەبوون د ناڤ چەروانگەهاندا فێری گەریانێ ببوون و دەست ژێ هەلنەدگرت.

**پرسیار:** بۆچی جڤاکێ خودانكرنا ئاژەلی ژجڤاکێ نێچیرڤانیێ مەزنترە ؟

### ٣ - قۆناغا چاندنێ :

فێربوونا چاندنێ ب مەزنترین گورین دژیانا مرۆڤیدا دهیتە هژمارتن چونکە چاندنێ وەل مرۆڤی کر کو خوجە بیت و ژئەردێ خوە دوور نەکەڤیت، و سنۆرەکی دیارکەت بۆ دەسهەلاتا هێزا کاری لسەر ئەردی،ئەوبوو نەچاربوو خانیا ئاڤاکەت وجهێ خوە ل نزیك کانی و رووبار و دەریاچەیان قایمکەت و خوجە ببیت ، هەر ئەڤە بوو ژێ وەکری کو پەرستگەه و بنگەهێن پارستنێ و خرڤەکرنێ و یاسا و پۆلیس و چەکداران بۆ پاراستنا بەرژەوەندیان دانیت .

ئەڤەژی بۆ ئەگەرا سەرهەلدانا بنەمایێن دەولەتێ . چونکە جڤاك هاتەگورین بوونە گوند و بازێر و پەیوەندیێن جڤاکیێن وان جڤاکێن چاندن دکر ئەو هێز وموکومیە نەما ، چونکە خەلك ل گوند و بازێران دژیان و ژهەڤدو ددووربوون .

**چالاکی:** (چاندن) وەرچەرخانەکا مەزن بوو دژیانا مرۆڤیدا ،دڤی بیاڤیدا دانوستاندن بهێتەکرن.

### ٤- قوناغا پیشەسازی :

قۆناغا داویێ یە ژ وەرارا ژیانا مرۆڤی ، ئەڤەژی پشتی وان بزاڤێن زۆرە یێن مرۆڤی کرین بۆ ڤەدیتنا نهێنیێن سروشتی و بکارئینانا وان بۆ خزمەتا خوە . ئەو زانیاریێن جڤاکی داهێناین، زانایا بۆ پشکنینا سامانێن سروشتی و بکارئینانێ بۆ خێر و خۆشیا مرۆڤی بکاردئینان. ل دەسپێکێ ب پیشەسازیا سڤك دەسپێکر، پاشی لپەی زۆربوونا پێدڤیان و زێدەبوونا بەرهەمی پیشەسازیا گران ل گەلەك جهێن جیهانێ پەیدابوو. ب رادەیەکێ وەسا کو هندەك جڤاك ژلایێ پێشکەفتنا وان ڤە دڤی بیاڤیدا ب جڤاکێن پیشەسازیا مەزن ناڤدارن ، هەروەسا هندەك بازێرێن بچووك ژی هێدی هێدی پێشکەفتن و بوونە بازێرێن مەزن ، حەتا رادەکی هندەك بازێر هژمارا ئاکنجیین وان گەهشتنە چەند ملیون کەسا و ل رویی تەکنولوژیا ب بازیرین ئەلەکترونی ناڤدار بون . ب رادەیەکێ وەسا کو هندەك بازێرا ژمارا ئاکنجیێن وان گەهشتە چەندین ملیۆن کەسان و ژلایێ تەکنۆلۆژیایێ ڤە ب بازێرێن ئەلەکترۆنی دهێنە ناڤکرن .

وەرارا پیشەسازیێ کارتێکرنەکا مەزن کرە سەر ژیانا ئابووریا گوندان، چونکە هژمارەکا زۆرا ئاکنجیێن گوندان بەرەف باژێرا مشەختبوون و مژوولی کارێ پیشەسازیێ بوون ، ئەڤ مشەختبوونە بۆ ئەگەرێ کێمبوونا ئاکنجیێن گوندان.
ئەڤ گوڕانکاریە بۆ ئەگەرا گورینا پەیوەندییێن جڤاکی و پەیوەنییێن راستەوخوە هەلوەشیان و پەیوەندییێن لاوەکی جهێ وان گرت ، ئانکو پەیوندی دناڤبەرا خەلکیدا لسەر بنەمایێ قازانجی ومفاییێ هاوبەش هاتنەئاڤاکرن . ئالۆزیا ژیانی و زۆربوونا پێدڤیا وەل مرۆڤی کر کو ئێدی نەشێت ڤان پێدڤیا ئامادەکەت.
رامان ژ دابەشکرنا کاروبارا دەرکەفتنا شارەزایی (پسپۆری) یێ یە کو ژئەگەرا پەیدابوونا شارەزاییێ پێدڤیێن جۆرا و جۆرێن مرۆڤی هاتنە ئامادەکرن ، ئانکو دابەشکرنا کاروبارا ب رەنگەکێ هەڤکاری و هاریکاریێ دناڤبەرا لاوێن جڤاکیدا دهێتەدانان.
ئەڤ گورانا دیرۆکیا جڤاکێ مرۆڤایەتییێ کو ل دەسپێکێ دچەند قۆناغێن هەمە جۆردا دەربازبوویە . لێ دگەل هندێ ژی قۆناغێن بەری قۆناغا پیشەسازی خاسیەت و نیشانێن خوە پاراستینە ، ئانکو جڤاکێن وەسا ژی هەنە کو هێشتا کارێ وان یێ سەرەکی نێچیرڤانی و خودانکرنا ئاژەلا و چاندنە. ئەڤە ژی هەمی بهەڤرا دگرێدایینە چونکە پیشەسازی دبینە ئەگەرێ پتربوونا بەرهەمێ ئاژەلی و زێدەبوونا درامەتێ چاندنێ.

## پرسیار

١– مرۆڤی دەسپێکێ دەمێ ژ شەکەفتا دەرکەفتی چ دروستکر ؟

٢– ئێکەمین بەرهەمێ سەر ئەردی پشتی نێچیرڤانیێ چ بوو ؟ چاوا بوو ؟

٣– لسەر سەرهەلدانا قۆناغا پیشەسازیا دەسپێکی باخڤە؟

٤– چاوا قۆناغا پیشەسازی کارکرە سەر ژیانا گوندا؟

٥– ئەرێ قۆناغا ئاژەل خودانکرنێ ژ قۆناغا نێچیرڤانیێ باشترە ، بۆچی؟

٦– ئێکەم جڤاکێ مرۆڤی چاوا ژ سنۆرێ خێزانێ دەرکەفت؟

### راهینان

هندەك ژ هزرڤانان دوێ باوەریێ دانە کو جڤاك دڤان قۆناغێن خارێدا دەربازبوویە:

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| قۆناغا نێچیرڤانیێ | و | | و | | و | |

## پەیوەندی

پەیوەندیێن جڤاکی ژ بنەماییێن سەرەکییێن پێکاهتنا جڤاکیە و پەیوەندییێن جڤاکی ب دیتنا هندەك هزرڤانا شەنگستێ سەرەکیە کو جڤاك لسەر هاتیەدامەزراندن ، یان جڤاك کورتیا وان پەیوەندیێن جڤاکیە یێن جڤاکی و لاوێن جڤاکی بهەڤراگرێددەت، ژبەر هندێ هەردەم بزاڤێ دکەن سیستەمەکی پێکبینن کو ئاراستەکرن وراگرتنا رەفتارێن وان لگەل ئێك رێکبێخیت، ئەرکێ ڤی سیستەمی ئەوە کو رێ بدەتە چالاکیا و دەمان دەمدا سنۆرەکی بۆ دانیت ، چونکە ئەو سیستەم دێ وان دەستنیشانکەت یێن پێدڤیە بهێنە کرن و یێن نابیت بهێنە کرن ژی ، داکو گرنگیا پەیوەندیێن جڤاکی ب باشی دیاربیت بلا گرۆپەکا کەسا بینینە بەرچاڤێن خوە کو ژیانا وان لسەر پەیوەندییێن جڤاکی نەهاتبیتە ئاڤاکرن ، ئەڤ جۆرە جڤاکە ژئەنجامێ نەبوونا ڤان پەیوەندیا دێ ژناڤچن کو ئەرك و ماف و تیتال و شێوێ هاریکارییێ دناڤبەرا واندا و ئارمانج و رەوشتێن گشتی دیاردکەت، گرۆپەکا ژڤی جۆری ب جڤاك ناهێتەناڤکرن ، چونکە ژیانا وان لسەر پەیوەندییێن جڤاکیێن ئاشکرا نەهاتیەئاڤاکرن ، ئەڤ گرۆپە دێ تووشی هەلوەشیانێ و ژناڤچوونێ بن . ئانکو پەیوەندییێن جڤاکی تنێ بۆ روویەکێ دیارکرییێ جڤاکی نینە، بەلکی هەمی ژیانا جڤاکی بخوەڤەدگریت ، هەر ئەڤیە ژی سنۆرەکی بۆ رەفتارا ژنێ بەرامبەر مێری دیاردکەت و رەفتارا قوتابی ل قوتابخانێ و رەفتارا زارۆکی بەرامبەر دایك و بابا و

رەفتارا سەربازی ل رۆژێن شەڕی و ئاشتیێ ، هەروەسا ئەو پەیوەندیێن دناڤبەرا دەستەیێن جودا جودایێن جڤاکیدا دروست دکەت و مانا وی مسۆگەردکەت .

**چالاکی:** ژ نموونێن پەیوەندیێن سۆز و دۆستایەتیێ پەیوەندیێن دناڤبەرا ............. , .............
ژنموونێن پەیوەندیێن ئابووری پەیوندیێن دناڤبەرا ............. , .............

هەروەسا نەخشێ نیشانێن گشتی بۆ ددانیت کو ژ جڤاکێن دیتر جودادکەت . ب ڤێ چەندێ گرنگیا پەیوەندیێن جڤاکیێن ژیانێ و بەردەوامیا جڤاکی دەردکەڤیت، پەیوەندیێن جڤاکی دهەردەمەکیدا وەکهەڤ نینن، ئەگەر جڤاکێ دەسپێکی و سادە بوو ، پەیوەندیێن جڤاکی دناڤبەرا واندا دسادە و دیارکرینە . ژیان دناڤ ڤان جڤاکاندا ب وێ چەندێ دهێتە نیاسین کو پێدڤیێن وان یێن جڤاکی دکێمن . وەك تیتالێن وان ژی پەیوەندیێن وان یێن جڤاکی دیاردکەت ، لێ ئەگەر جڤاکێ ئالۆز بوو یان جڤاکەکێ نوو بۆ پەیوەندیێن جڤاکی ژی دێ بەرەڤ ئالۆزیێ بن ، دێ بێژنە هندەکا پەیوەندیێن ئابووری و هندەکێن دیتر کەسایەتی و هندەکا دۆستایەتی یان دوژمنایەتی ، مینا پەیوەندیێن ژن و مێرینیێ و هندەکێن دیتر ، یان هندەکا گونجاندنا مفا و قازانجی راگرتیە ، وەکی پەیوەندیا دناڤبەرا کرێکارا بخوەدا ، یان هندەك ژ پەیوەندیێن دیتر کو دبەرژەوەندێدا ناگونجێن وەك : پۆلیس و گونەهبار.



ب ئاوایەکێ گشتی پەیوەندییێن جڤاکی دبنە دو بەش:

## ١- پەیوەندییێن راستەوخوە:

وان پەیوەندیان بخوەڤەدگریت یێن ناڤبەرا تاکێن یان ئەندامێن جڤاکەکیداهەین کو لسەر بنەمایێ سۆز و ڤیانێ و پەیوەندیێن خوینێ هاتیەئاڤاکرن، و پەیوەندیەکا بەردەوامە و زۆر جارا ڤێ پەیوەندییێ دچارچووڤێ خیزانا مەزن و بچووکدا پیرۆزیا خوە هەیە ئانکو پەیوەندیا دناڤبەرا دایک و خووشک و برا و کەس و کارێن پلە دو.

**چالاکی:**

پەیوەندیێن راستەوخوە وەك پەیوەندیێن دناڤبەرا

أ- دایك و

ب- برا و

ج-باب و

۲- پەیوەندیێن لاوەکی(نەراستەوخوە):

ئەڤ پەیوەندیە ژ ئەنجامێ هەڤنیاسین و تێکەل بوونێ ب ئاوایەکێ نەراستەوخوە پەیدادبن ، ئەڤ سوز و ڤیانە لسەر بنەمایێ نزیکیا خوینێ پەیدانابیت ، بەلکی لسەر بنەمایێ ئەرك و مافان بەرامبەر هەڤدو و جڤاکی پەیدادبن، وەکی پەیوەندیێن دناڤبەرا مامۆستای و قوتابیدا و فەرمانبەری بەرامبەر کار و فەرمانگەها وی ، هێزا پارێزەر بەرامبەر ئاخێ و ولاتی. ژبەر هندێ ژی ئەڤ پەیوەندیە ب پەیوەندیا فەرمی هاتیەناڤکرن چونکە بنەمایێن وێ بجهئینانا ئەرکێ تاکیە دجڤاکیدا وئەو ئەرکێن لسەر وی بەرامبەر کەسێن دیتر بێ لادان و جیاوازیکرن . ژئەڤێن مە لسەری باسکرین بۆ مە دیاردبیت کو پەیوەندیێن جڤاکی بزاڤکریە گەلەك ژئارمانجێن .

## گرنگ بجه بینیت وەکی:-

۱- رەوشەنبیریا جڤاکی وەسا مە هیدکەت کو رەوشت و رەفتارێن خوە بەرەف قازانج و مفایێ لاوێن جڤاکی ئاراستەکەین .

٢– پەیوەندیێن جڤاکی مروڤی بەرەف تێگەهشتنا رامان و بهایێن جیاواز رادکێشن کو ب سیستەمێ جڤاکی ڤە هاتیەگرێدان و وەلێدکەت کو ژیانا خوە لگەل ڤی سیستەمی بگونجینیت.

٣ – ڤەکولینا پەیوەندیێن جڤاکی هاریکاریا مە د وێ چەندێدا دکەت کو دئاریشێن جڤاکی بگەهین و ب رێیا ڤێ ژی هاریکاریا مە دهێتەکرن کو نەخشە و پلانا دانین ژبو چارەسەرکرنا ڤان ئاریشان.

**چالاکی:** ژ نموونێن پەیوەندیێن لاوەکی

أ– پەیوەندی دناڤبەرا ماموستا و ........

ب– پەیوەندی دناڤبەرا فەرمانبەر و ........

٤– تێگەهشتنا پەیوەندیێن جڤاکی دکەڤیتە سەر ڤەکولینا دیاردا و روودانێن دیروکیێن جڤاکی . کو ئەڤەژی رێیەکا زور گرنگە ژبو زانینا رەوشا نهویا جڤاکی.

٥– دانانا پلانێ بو پاشەروژێ کو پشت ب وان پەیوەندیێن جڤاکی دبەستیت یێن دناڤ جڤاکیدا دبەلاڤ . وەکی وان گورانکاریێن گرێدای پێشڤەبرنا ئارمانجێن جڤاکی ژلایێ باشی و چالاکیا تاکی و جڤاکی ڤە.

راهینان

ژ نموونێن پەیوەندیان , بە هەر ئێکی دووا بنڤیسە :

| پەیوەندیێن راستەوخوە | پەیوەندیێن نەراستەوخوە |
| --- | --- |
| وەکی | وەکی |
| ١- ............. | ١- ............. |
| ٢- ............. | ٢- ............. |

## ئەرك و مافێن کەسان د جڤاکیدا :-

هندەك ژخودان هزرێن جڤاکناس دەست ب ڤەکۆلینا لسەر تاکەکەسی و جڤاکی کریە، هەر ئێك ژ وان بتنێ ، هندەکا پویتە ب تاکەکەسی دایە،لێ هندەکێن دی بەرژەوەندیا جڤاکی ئێخستیە پێش بەرژەوەندیا تاکەکەسی ، ئەوێن پویتە ب تاکەکەسی دای ، دگۆت تاك بەری جڤاکی هەبوویە، تاکەکەس بنەمایێ پێکهاتنا جڤاکی یە، کو بێی تاکە کەس جڤاك پێك ناهێت ، ژبەر هندێ دڤێت بەرژەوەندیا تاکەکەسی ب رێیا ئاسایشا تاکی وبەردەستکرنا تەڤ فاکتەرێن ژیارەکا خۆش و ئایندەکێ گەش بهێتە پاراستن . لێ بەشێ دووێ ژخودان هزرا کو پویتەی ب جڤاکی ددەن د وێ باوەریێ دانە کو تاکەکەس بەرهەمێ جڤاکیە ، چونکە تاکەکەس بتنێ نەشێت چ بکەت وجڤاك تاکەکەسی بۆ ژیانا جڤاکی بەرهەڤدکەت و پاراستنێ بۆ مسۆگەردکەت . هەمی شیان و ژێهاتنێ

پێشکێشی وی دکەت دابکەتە مرۆڤەکێ تەواو ، دتەڤ جڤاکێن جیهانێدا تاکەکەسی و جڤاکی مافێن تایبەتی هەنە . ژبەرکو ئەڤ بەشە زۆر باسێ مافێ تاکەکەسی دکەت ، دجڤاکیدا رامانا(ماف) دچارچووڤێ هەڤولاتیبوونێدا گەلەکا بەرفرەهە ، چونکی رامانا وێ لپەی جیاوازیا جڤاکا دهێتە گورین ، ئەو جڤاکێن زۆر پێشکەفتی مافەکێ زۆر دایە تاکەکەسی کو دجڤاکێن دیتردا ناهێتەدیتن ،بەلێ دهندەك جڤاکێن دیتردا تاکەکەس ژ بچووکترین مافێن مرۆڤی دبێ بەهرن .

**چالاکی:** ئەز ولاتیەکێ کوردستانی مە :

ئەرکێن لسەر ملێن من بەرامبەر وەلاتی :

١- [ ] ٢- [ ] ٣ - [ ]

**دگەل ڤێ ژی دا دناڤ جڤاکێن جیهانێدا هندەک مافێن بەرنیاس هەنە وەک:**

### ١- ماف و سەربەستی:

ئەو جڤاکێ ماف و سەربەستیەکا بەرفرەه لاوێن خوە دبەخشیت، ژجڤاکێن دیتردا ژ لایێ جۆرێ رەوشتێ تاکەکەسی ڤە جودایە، دڤان جڤاکاندا بۆ تاکەکەسی هەیە وان کار و رەوشەنبیریا هەلبژێریت یێن لگەل شیانێن هزر وبیرێن دگونجن، و هەمی مافەك نابیت لپەی وان بیت یێن پێکهاتن لسەر هەی، چونکە تاك زێدەباری وێ چەندێ کو خودانێ حەزا تایبەتا خومیە ، لێ ئەو تاکە دهەمان دەمدا ژی بەشـــەکە ژ

جڤاکێ مەزن ، ئانکو لسەر  وی یە پێگیریێ ب وان تشتا بکەت یێن لسەر پێکهاتین . و ئەڤە گرنگترین نیشانێن گشتیێن ماف و سەربەستیێن تاکەکەسی نە د جڤاکیدا . کو پێکدهێن ژ ژیان و خواندن و پاراستن و بیرورا دەربرین و پاراستنا ساخلەمیێ و جۆرێ جلکا و خودا پەرستنێ و چوونا ناڤ گرۆپ و سەندیکا ب تەڤ جۆرێن وان ڤە. تەڤ دەستوور و یاسایەکێ دجیهانێدا دان ب ڤان ماف و سەربەستیا دانایە ، چونکە زۆر دگرنگن ژبۆ موکوم کرنا پەیوەندیێن دناڤبەرا تاکەکەسی وجڤاکیدا .

راهینان

(سەربەستی) ئازادیە یان سەربەردانە یان پێگیریە ب بها

تۆ : بەرسڤا راست هەلبژێرە

**٢- وەکهەڤی:**

وەکهەڤی ب مافەکێ گرنگێ نەڤیێن مللەتی دناف جڤاکیدا دهێنە دانان ، چونکە بەلگێ دادپەروەریا جڤاکیە ژبۆ بدەستڤەئینانا دەلیڤێ بۆ هەر ولاتیەکی دناف جڤاکیدا ب ئەگەرا هندێ ژی دناف لاوێن جڤاکیدا پلا هاریکاری و پشتەڤانیا جڤاکی بلند دبیت و باوەریا خەلکی ب دسهەلاتا هەلبژارتی پتر لێ دکەت.

**چالاکی:**

دو گرۆپ ژ قوتابیان دێ دو راپۆرتا لسەر (ماف و سەربەستی)و (وەکهەڤیێ) ئامادەکەن ، بۆ وانا دهێت دێ دانوستاندنێ لسەرکەن

## پرسیار

١- گرنگیا پەیوەندیێن جڤاکی د درستبوونا جڤاکیدا چیە؟

٢- باسێ سێ نموو نێن پەیوەندیێن جڤاکی دبازێرێ خوەدا بکە؟

٣- مەرەم ژ پەیوەندیێن راستەوخوە و نەراستەوخوە چیە ؟

٤- مەرەم ژ هەڤگرتنا جڤاکی چیە و روهن بکە ؟

٥- بۆچی پێشکەفتنا زانیاریا یاپێدڤیە بۆ بەختیاریا جڤاکی ؟

٦- بۆ پێکگوڕینا زانستی مەرجە جڤاك هەڤکاریا هەڤدو بکەن ؟ بو چی ؟

# جڤاكێ شارستانی

چڤاكێ شارستانی ئەو چڤاكە یە كو تاكێن وێ شیاینە بگەهنە رادەكێ وەسا پێشكەفتنێ كو بساناهی ژ چڤاكێن هەڤسوی بهێنە جوداكرن ، ڤێجا ئەف پێشكەفتنە چ ژ لایێ هزری یان كەلتوری یا فەرهەنگی یا زانستی یا بیناسازیێ یان ئەخلاقیڤە بیت یان هەر بیاڤە دی بیت یێ كو ب ئەگەرا وی بشێت خاسیەتەكێ ژ خاسیەتێن شارستانیێ ل دەف خوە پەیدابكەت و ژ چڤاكەكێ دیتر یێ مروڤان بهێتە جودا كرن.

ئانكو شارستانیەتیا چڤاكان خوە د وان دەستكەفتێن زور هەمی لایی وجودا جودا یێن چڤاكیدا خو دبینیتە ڤە كو تاكان ب كار و ماندیبونا چەندین سالان بدەستڤەئینانیە ، یان شیاینە مفای ژ دەستكەفت و شارستانیین هەڤسوییێن خوە وەربگرن و هندەك گورنكارییێن تێدا بكەن و دووبارە بۆ بەرژەوەندیا چڤاكێ خوە بكاربینن . ئەو چڤاكێن ئاستێ پێشكەفتنا شارستانی وان ژ چڤاكەكە دیتر ب هەر ئەگەرەكێ بیت ل پێشتربیت ، دی بینین رادێ بزاڤا تاكێن وان و رادێ گەشەكرنا زانستی و ئاڤكرنێ و كەلتورێ وان ل چاڤ چڤاكێن دی ل پێشترە ، ئەڤەژی وێ بۆمە روهن دكەت كو ب شارستانیبونا چڤاكی چەندە د بەرژەوەندیا نهۆ و داهاتیا چڤاكیدا.

نەتەوێ كورد ژی وەك نەتەوێن دی خودان شارستانیەتا خویە دگەل هندی ژی دگەل نەتەوێن هەڤسوە پشكداریەكا جالاكی شارستانیا دەڤەرێ دا هەبوریە ، ئەڤەژی چەندە دگەهینیت.

کا جڤاکێ کوردستانێ چەندە چڤاکەکێ شارستانیە و چەندە چڤاکەکێ د ژ ب هەمی رووکارەکێ نە شارستان بوویە، ئەڤە و دیرووکا نەتەوێ مە بریتیە ژ سیمایێن شارستانی د ئاڤاکرنی و ئەزمان خوش وئەدەب و زانستێ ، بەلێ نەیارین چڤاکێ کوردستانی هزرا نەتەوە پەرستییێ و تەماعکارانە ئنایە د ناڤ چڤاکێ کوردیدا و کەلەك رووکارێن شارشتانی و مروڤی و زانستی هەیە ب درێژیا دیرۆکێ ژناڤبریە و کلتۆر و شارستانیا خوە ب سەر داسەپاندیە ، ب مەرەما بەرزەکرنا ناسنامانە تەوایەتیا. چڤاکین شارستانی بێ بنەما بناغێن دیار کری ناهێنە دامەزرندن ، یێن د وان جڤاکاندا دهێتە دیتن ژی مەرج نینە ژ لایێ ناڤەروکێڤە ب هەڤد بچن ، چونکە هەر چڤاکەکی بنەمایێن تایبەت وبنەمایێن گشتی هەنە، ل ڤێرێ دا گرنگترین بنەمایێن چڤاکێ شارستانی دشێین د ڤان چەند خالین خارێ دا کورت کەین:-

**چالاکی:** ژ خاسیەتێن چڤاکی شارستانی

**ئێك :** پێشکەفتنە ل لایێ ................................

**دوو :** پێشکەفتنە ل لایێ ................................

### ١- بنەمایێ ئاڤكاری (عمراني):

ئانكو هەبوونا رەوشەكا مروڤی یا وەسا كو تاكێن وی چڤاكی بشێن چڤاكەكێ ئاڤاكای وەسا دروست بكەن ، ب شێوەكی تەناهی و ئاسایش بو دەمەكێ دوور و درێژ بەرقەرار ببیت و پرۆژێن ئاڤەدانكرنێ و زیارێ هاتبنە مسوگەركرن دا كو دەلیڤە یا داهێنانێ بۆ ئەندامێن چڤاكی پەیدا بن.

**چالاكی:** ژ نمونێن ئاڤاكای
أ- گەشەپێدانا پروژێن ژ یێرخانا ئابووری.
ب- پروژێن ( ژبرخانا ئابووری ) وەكی چ؟

### ٢- بنەمایێن ئابووری:

ئەڤەژی وێ دكەهینیت هەر ئێك ژ وان چڤاكێن شارستانی خودان ئابووریەكا تایبەت ب خوڤە و چاوانیا بەرهەمئینانێ و دابەشكرنا بەرهەمی ، ئامیرێن بەرهەمئینانێ ژی بخوە ڤەدگریت ، لەورا سەیرنینە لاندكا چڤاكی شارستانیێن مەزن نزیكی رووبار و سەروكانێن ئاڤان، چونكی هاریكاریا پروژێن ئاڤدان و ئاڤاكایا چڤاكان ددەت.

### ٣- بنەمایێن رەوشەنبیری و كەلتۆری:

ئەگە بنێرینە چڤاكێن شارستانی ، دێ ببینین هەر ئێكەك كەلتور و رەوشەنبیریەكی بكاردئینت جودا ژ چڤاكەكێ دی ، ئەڤەژی خوّ د شێوازێ نڤیسینێ و ئاخفتنێ و جللك لبەركرێ و تیتال و نەریتێن چڤاكی تڤایا رەفتارێن تاكێن وی چڤاكدا دبینتە ڤە د هەر ئێك ژ وان چڤاكێن شارستانیدا ب جورەكیە و ژ یێ دیتر جودانە.

### ٤- بنەمایێن هزری ( فکری ):

ئەڤە بنەمایەکێ گرنگە ، چونکی کارتێکرنا راستە و خوە ل سەر بنەمایێن دیتر هەیە. مەرەما مە رادێ وان بیرو چوونن یێن کۆ چڤاك گەهشتییێ و بەرجەستەکرنا هزرکێ د چار چووڤەکێ دیارکری دا ، کاربێکرن ب رەنگەگێ ئارەزوومەندی یان ب خورتی

**راهینان**

ژ بنەمایێن چڤاکێ شارستانی

بنەمایێن [ ] و [ ] و [ ]

### ٥- بنەمایێن ئایین ( ئۆلی ):

ژبەر کو ئایین رولەکی مەزن ل رێکخستنا چڤاکیدا دگریت ، سەیرنینە د چڤاکێن شارستانیدا ئایین بو یەبنەمایەکێ گرنگی برێڤەبرن و رێکخستنا ژیانا روژانە یا خەلکی ل هەر ئێك د ڤان ژ چڤاکێن شارستانیدا دەستهەلاتدارن خۆ ب ئایینەکی ڤەگرتیە ، ئان ژی کارگریە ئایینەکی بو خۆ چێکەن.

### ٦- بنەمایێ زانستی و فەلسەفی:

ئەڤەژی بنەمایەکێ گرنگ چڤاکێن شارستانیە، ژ بەرکر کارتیکرن ل سەر رادێ بەرهەمئینانێ و ئاراستەکرنا بریڤەبرنێ و ەرفتارێن تاکێن چڤاکی هەبوویە و ئەو هزر و بیرێن زانستینە بروژێن سکرێن لسەر رووبارا و ئامیرێت بەرهەمئینانی یین نوی دادهینن ، ئەو هزر و بیرین فەلسەفیانەن رەختی ژ بیرو بۆ چوونێن چڤاکی د گرن و دخازکەرێن گورنکاریانە.

### ٧- بنەمایێ یاسایی:

یاسا بنەمایەکێ گرنگی رێکخستنا ژ یانا مروڤانە ، ژبەر هندێ چڤاکێ شارستانی دەستپێکێن یاسا دانانێ ئەڤ یاسایە ژی ل دەستپێکێ ب شێوەکی بێکهاتن یا پەیمانێ بوو و باشی ژ لایێ دەسهەلاتدارا ڤە بو دەقێ یاسایی هاتە سەپاندن.

| **چالاکی:** بو شلوڤەکرنا رولێ یاسایێ چێتییت مێهڤانداریا یاسا ناسە بهێتەکرن دا کو سمینارەکێ ل قوتابخانێداتە دڤی بیاڤیدا پێشکش کەت. |
|---|

### ٨- بنەمایێ دەسهەلات ( حوکم ) :

رەمانا ژ ڤی بنەمای ئەوە کو ل هەر ئێك ژ چڤاکێن شارستانی رێڤەبەریەك هەیە بو ریڤەبرنا کاروبارێن خەلکی و چارەسەرکرنا ئاریشە و رووداںا و تەپەسەرکرنا نەرازیبویان.

د ڤی حوکم کرنێ دەسهەلاتدار پشت ب یاساێین هاتینە دانان و دامەزراوێن چڤاکی و دامەزراوێن سوپایی دبەستیت .

**راهینان**

هەکە چڤاکەکی دەزگا و دەسهەلات تێدا نەبوو, دێ چ روو ددەت؟
بوچی (( هەبونا دەسهەلاتی )) پێدڤیە؟

بەنـــدێ پێنچێ

# یاسایین چڤاکی

**پێناسا یاسایێ:** ئەو رێککەفتنا گشتیا چڤاکیە لسەر چەند دەقەکا کو د بەرژەوەندیا خەلکی دانە ، ڤێجا ئەو دەقە د نڤیسی یان زارەکی ، ئارمانج ل دانانا یاسایێ رێکخستنا ژیانا روژانە یا خەلکیە لسەر ریکەکا دروست و دیارکرنا رەفتار و کریارێن مە ب مەرەما باشترکرنا رابون و روونشتینن مە و جوداکرنا ماف و ئەرکێ هەر تاکەکێ چڤاکیە . چڤاکێن مرۆڤایە تێدا. یاسایێ رۆلەکێ گرنگ و بەرچاڤ گێرایە ل رێکخستن و ئاراستە کرنا وەلاتیا بۆ باشترکرنا پەیوەندیێن مروڤی ب برایێ وێ یێ مروففە ، یاساییێن چڤاکی بۆ هندێ دهێنە دانان دا کو ماف و ئەرکێ هەر ئێکی ژ مە دیار بکەت و هەر ئێك ژ مە بزانیت چ ئەرکەك لسەرە ئانجام بدەت و چ مافەك هەیە داخاز بکەت. ژ بەر هندی تێگەهشتنا گیانی یاسایان تێگەهشتنە ل ئەرك و مافان . هیچ چڤاکەکێ مروڤایەتی نابینین شیابیتن دەست ژ یاسا بەردابیت و ب بەرلالایی کارکربیت بلا ئەو چڤاکە چڤاکەکێ دەسپێکێ ژێ بیت هەر چەند یاسا د چڤاکیدا بەر قەراربیت هندە ئەو چڤاك د شێت کار و بارین خوە رێکبێخیت و بیاڤێ کارکرنی و مسوگەکرنا پێدڤیێن خەلکی بەرهەفکەت ، یاسا ل گور رادی پێشکەفتنا چڤاکی زور ئالوز دبن ، چونکە چەند چڤاکێ مروڤایەتی داهێنانێن نوو بنیتەگوزێ هند پێدڤی ب دارێشتنا دەقێن یاسایێن نوو دبیت ژبەر هندێ ، سەیر نینە ببینین چڤاکەێن دەسپێکی ل چاڤ چڤاکێن نهو دەقێن یاسایێن خوە ل گورەی ژیانا سادەیا یا خوە رێکخستبوون هەر وەسا چەند ئارێشەێن چڤاکی و ئابووری و رامیاری ژی زور ژ بۆ چارەسەرکرنا وان ئاریشا.

ل ڤێرە جهێ خودانێن ئامازێ ب چەند نموونەکێن یاسایێن چڤاکا بکەین و گرنگیا وان یاسا بۆ مە دەرکەڤیت، یاسایێن رێکخستنا هەڤژینیێ گو گرنگیێن د دەتە دروست کرنا خێزانا دیارکرنا مافی هەر ئێك و مێر و زراوکان ، هەروەسا یاسایێن ترافیکێ کو دیروکا وان د زڤریتە سەر دەمێ داهینانا ترومبێلا گرنگیی د دەتە رێکخستنا هاتن و چوونا ولاتیان ب و ترۆمبێلێن خوە و چاوانیا بکارئینانا رێیا و سزایێ سەرپێچی کەران د دەت. بتایبەتی ئەوین رێزێ ل نیشانێن ترافیکێ نەگرن.

**راهینان**

یاسا بو رێکخستنا ژیانا مە یا روژانە هاتینە بەرهەفکرن چەند جورێن یاسایا هەنە ژ وان

| یاسایا ترافیکێ | و | | و | |
|---|---|---|---|---|

یاسایێن سزادانا گونەهباران ل سەر دزیێ و کوشتنێ ، هەر دیسا یاسایێن چڤاکی گرنگن کو ب رێیا وان ، بێ گونەهـ دشێت مافێ خوە داوا بکەت ژ دادگەهان و سزایێ پێدڤی بۆ گونەهباری دیاردکەت ، کو هندەك ب زیندانکرنێ و هندەك ب هژمارا زیانا و قەرەبۆکرنێ ب دوای دهێن.

ئانكو ياسايێن چڤاكى بو هندى هاتينه دانان دا كو هەر تاكەكى چڤاكى ژ نك خوٚ كارەكێ وەسا نەكەت دژى بەرژەوەنديا خەلكى ڤان بيت و كەسى زيان گەهشتنێ نەشێت ب ئارەزوويا خوە مافێ خوە وەربگريت ، چونكه پێكيرى نه كرن ب ياسايا بەرەلاييێ د ئافرينيت ، ژبەر هندى پێدڤيه لسەر هەمى ئەندامێن چڤاكى رێزێ ل ياسايين چڤاكى بگرن و برێيا ياسايان داخازا مافێن خوٚ بكەن و هەر ب رێيا ياسايا ئەرك بسەردا دهێنه سەپاندن.

**راهينان**

| أ | ب |
|---|---|
| ياسا بەرژەوەندين تاكى د پارێزێت پارێزيت | هەروەسا ياسا بەرژەوەنديين ................ د |

**چالاكى:**

ماموستايێ هێژا : ب هاريكاريا كارگێريا قوتابخانێ دشێ مێڤانداريا

١- ئەفسەرەكێ ياسا ناسێ ( ترافيكێ ) بكەت.

٢- دانو ستاندنێ دگەل قوتابيێن پولەكێ يان قوتابخانێ بكەت.

بەنـــدێ شەشێ

# دابین چڤاکی

## أ- دابین چڤاکی:

چەند پەیوەندیین چڤاکی ئەندامێن چڤاکی بهەڤرا گریددەن، کو کۆمەکا رێباز و رەفتار وپەیوەندیین چڤاکی دەست ب سەر داگرتیە ئەو ژی رەوشت و تیتال و نەریتن بەر بەلاڤێن چڤاکی و باوەری و ئایین و یاسایان و دەزگەهێن چڤاکی و ئەندامێن خۆ هاندەدەن بو فێربوون و پەسەندکرنا پیڤەرین دروستێن چڤاکی و داب نەریت و رەوشتێن باش. چڤاکێ مروڤایەتی هاریکاریا ئەندامێن خۆ دکەت بو تێرکرن و مسۆگەرکرنا پێدڤیێن وی دگەل ڤێ چاندێ ژێ دا پێدڤیە چڤاکان تایبەتمەندیێن خۆ ژی هەبن ئەو مەرجێن پێدڤی ژ بۆ مانا چڤاکی ئەڤێن خارێنە:-

١- دڤێت پەیوەندیین چڤاکی دناڤبەرا ئەندامێن چڤاکیدا هەبن بو پێکئینانا چڤاکی.

٢- دڤێت کەرستە و خزمەتگوزاری بەرهەمبینیت بو تێرکرنا پێدڤیێن سروشتی و دەروونیین ئەندامێن چڤاکی ل دیڤ شیانا و شێوکێ داد پەروەرانە لسەر وان بێهێنە بلاڤە کرن .

٣- ئەندامێن چڤاکی ژ وان مە ترسا بپارێزن کو ب ئەگەرا دەورو بەری سروشتی و چڤاکی ئ دەمێ توشی دبینێ.

٤- ژبەر کو مرن ئەنجامێ داویێ هەمی مروڤەکیە دڤێت ل شوینا وێ زیانا دڤی بیاڤیدا دگەهیتێ زیانێن وان پێ بهێنە دان.

### راهينان

ژ ئەمرازێن دابینکارنێن چڤاکی

أ- داب نەریت ب- جـ-

٥- ئەندامێن چڤاکی د بن جۆرەکێ چاڤدێریکرنێ و رێکخستنێ و دابینکرنێ دا بن.

## ب- دابینکر ژ دو توخمێن سەرکی پێکدهێت:

١- هەبونا پیڤەر و بهایەکێ چڤاکی دا کو رەفتارێن دروست ژ رەفتارێن شاش جودا دکەن ل پەی ڤێ چەند ژی خەلك لسەر راست و شاشیا کار و کریارارو هزرو بۆ چوونێن خو خەلکێ دیتر ددەت .

٢- هەبونا خەلات و سزا بو پالدانا خەلکی دا لسەر ب رێکا پەسەند یا چڤاکی رەفتار بکەن ئەڤە ژی دوو جورە. ( چاك) :وەك چڤاك رازیبوونا خوە بەرامبەر رەفتاری وان دەربریت بشێوێ خەلات وەکی : پێدانا مەدالیایەکێ ، نیشانا خەلاتیە . جورێ دی ( خراب ) کو چڤاك نەرازیبوون و تورەییا خۆ بەرامبەر رەفتارێن وان دەردبریت ئەڤە ژی د ناڤبەرا ب سفك لێ نێرینێ شەرمزارکرنێ تاکو دکەهیتە زیندانکرنی و دوور ئێخستنێ ژچڤاکی.

هەکە بتنێ پشت ب خەلاتکرنێ و سزادانی ببەستیت ئانکو پشت بهێتە بەستن کو هندەك ئەندامێن چڤاکی لسەر هندەکێن دی بسەبینین راستی ئەوە هەر ئێك پشکەکا مەزنا بەریرسیاریا رەفتارێن خوە بێخیتە ستوییێ خوە نێر بیت یان مێ. ب خوە چاڤدرێیا خوە بکەن ودشێن بخو بریارێ ل سەر خوە بدەن وەك (هەست کرن بگونە هاریی ، یان شانازی بخو کرێ)
ئەڤ بهایێ ئەرکی پێگەهاندنێ و پەروەردەیا چڤاکێ بۆمە دەردئێخیت ئەندامێن چڤاکی رێزی ل پیڤەرێن چڤاکی دگرن و پێ رازی دبن بو نموونە: ئەندامین خێزانێ فێربوینە گوهداریا دیك و بابان بکە.

**راهینان**

١- ئەگەر قوتابی چالاکیەکا سەرکەفتی ئەنجامدا دڤێت ..............بکەین.
٢- ئەڤەر ولاتی کارەکێ خراب ئەنجامدە دڤیت ............... بدەن.
٣- ئەگەر ( سزا ) و ( خەلات ) نەبیت دێ چ هێتە روودان؟

دگەل ڤێ چەندێ ژی د قوتابخانێدا فێری رەفتارین جوان و چاك دبن و ل سەر جادا دا ژی پێگیرییێ ب شیرەتێن ترافیکێ و دکەن و د بیاڤێ کارك نێدا فێری وێ خۆ بۆ یاساییێ بچەمینیت ئانکو مروڤ د ژیانا ئاساییدا وەك ( ئەکتەرەکێ ) سەرشانوییێیە لێ بزاڤ و لڤینا وی و سەربەست ترە لێ پەیوەندیین چڤاکی ژهەمی لایەکی ڤە وی دور پێچ دکەن ئەڤە ژی ژ چڤاکەکی بۆ چڤاکەکێ دی تر دهێتە گورین.

**راهينان**

ژ کەناڵێن ( ڕایا گشتی )

| رۆژنامەکەری | و | |
|---|---|---|

**ئەو هۆ کارڕێن دکەنە سەر داپینکرییێن چڤاکی ئەڤەنە :**

١- ڕایا گشتی

٢- سەرکردایەتی

٣- یاسا

٤- ئایین

ب کورتی دێ ل سەر ڤان چار لایەنا ئاخڤین:

**راهينان**

( ڕایا گشتی ) دشێت دەربرینێ ژ خۆ بکەت

| خونیشاندان | و | |
|---|---|---|

## ٢- سەرکردایەتی:

رۆلەکێ کاریگەر هەیە بو بدەستڤەئینانا ئارمانجێن گشتیێن جڤاکی لێ د پرانیا جڤاکاندا دەسهەلاتەکا زۆر د ئێخنە دەستێ تاکە کەسەك و ب فەرمی دانپێدان دهێتە کرن کو ئەو سەرۆکە . لێ فەرمانا سەرگردایەتێن میرکاریێ ئانکو نە میرکاریانە لسەر چەند ئەندامین جڤاکی هێنتە دابەشکرن وەکی سەمیان ، یان مەزنێ خێزانێ و سەرکردی قوتابخانێ و کارگێری و رامیاری سەرکردە د ڤان بیاڤان و بیاڤێن دیترێن ژیانێ دا رۆلەکێ کارێکەر هەیە ل رویی رێکخستن و رەفتارکرن . وەلێ دکەت باوەری ب ئارمنج و مەرەمێن وان بینیت و هندەك جارا ژی دشێت پەیوەندیان و داب نەرتیێن جڤاکی و هەتا یاسایێن جڤاکی ژی بکوریت هەر وەکو فەرماندی رامیاریە

**سەرکردایەتی گەلەك جورە دشێن دو جۆرا دەستنیشان بکەین:-**

**جورێ ئێکی :** ئەو کەسن یێن خاسیەتێن سەرکردایەتیێ تێدا نینن وەکی ژێهاتی و خودان شیان و هزر و بیرەکا پێشکەفتی و شیانا د خەلکی گەهشتنێ و خەلك پشتگریێ لێ بکەت.

**جوری دوییی :** ئەڤ جۆرێ سەرکردایەتیێ کۆ لسەر ژیهاتن و شیانێن وی سەرکردایەتی پلە و پایە کێ د دەتی

| راهینان |
| --- |
| ب پەیڤەکا بکێر هاتی ڤان ڤالاهیان پڕ بکە |
| سەرکردی ژیهاتی وهەڤچەرخ ئەو سەرکردەیە کو |
| بە [ ] دگەهیتە پلە و پایێ دەسهەلاتی |

## ووشه

١ – بـ زورا هيـزى ٢ – بـ هەلبژارتنا

**٣- ياسا:-**

پێکهاتیە ژ کۆمەکا دەستووران بو رێکخستنا پەیوەندیین چڤاکی دەولەت وان د پارێزیت و وەل جەما وەری دکەت رێزێ ل یاسایێ بگرن.

**گرنگیا یاسایی:**

١- یاسا مافێ خەلکێ دەستنیشاندکەت و کریارین نە رەوا و قەدەغەکری دیار دکەت چ تاکە کەس بیت یان چڤاك.

٢- یاسا ب رێیا دام و دەزگەهێن خوە دەسهەلاتی ل سەر خەلکی و چڤاکی و دەرگەهاندا دسەپینیت و یاسا ژی بو ڤی مەرەمی هاتیە دانان وەك دادگەهـ و پۆلیس و زیندان.

٣- یاسا ل گورەی چڤاکێن مروڤایەتی دهێتەە گورین بۆ نموونە:

چڤاکی دەسپێکێ – یاسایا نەریتی ( القانون العرفی ) پەیرە و دکەن لێ چڤاکێ شارستانی یاسایا دنانی پەیرە و دکەن .

**ئایین (ئۆل) :**

رۆلەکێ گرنگ هەیە ل چڤاکی و وەل خەلکی دکەت پێگیرێن بها و پیڤەرین چڤاکیێن ناڤ چڤاکی بن و نابیت دەسهەلاتا خو ب سەر خەلکیدا بسەپینیت و پاڤژیەکا ژیرانە بو دەسهەلاتداری بکەت . ئایینی گەلەك فەرمانین بنچینەیی ل ناف چڤاکێ مروڤایەتی هەنە و رێزین چڤاکی موکوم دکەت و پشتگیریا پەیرە و ورەوشتێ تاکە کەسی دکەت وەل خەلکی دکەت هەست ب ناسناما خوە بکەن و ل دەمێ

لێقەومینا دلەدلەی وان ددەت و بیهنا وان فرەهدکەت و پاکیێ بو پرانیا کارین وان دخازیت.




**پرسیار**

**١- بومان چڤاکی بێدڤی ب چیە؟**

**٢- توخمێن دابینکرنێن چڤاکی بهژمێرە.**

**٣- ئەو هوێین کار د کەنە سەر دابینکرنێن چڤاکی بهژمێرە**

**٤- رامانا سەرکردایەتیێ پێناسە بکە**